عومەر مەعروف بەرزنجی



# مەحموود خانی دزڵی

# شۆڕشگێڕی رۆژهەڵاتی کوردستان

عومەر مەعروف بەرزنجی

# مەحموود خانی دزڵی
# شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان

چاپی دووەم

چاپێکی زیادەو بژارکراو

کاوەی ئەنوەر بەگی مەحموودخانی دزڵی

ئەرکی چاپکردنی لەئەستۆ گرتووە

2000

- ناوی کتێب: مەحموود خانی دزڵی
- بابەت: مێژوویی.. 284 لاپەڕە.
- نووسینی: عومەر مەعروف بەرزنجی
- چاپی یەکەم: کۆمپیوتەری ئەپڵ – هەولێر 1997 .
- چاپی دووەم: سەنتەری کۆمپیوتەری شەبەنگ – سلێمانی 2000 .
- سەرپەرشتی چاپ: ئاراس عەبدولقادر مەعروف بەرزنجی.
- چاپخانە: نووسینگەی ئازاد بۆ چاپەمەنی.
- ژمارەی سپاردن: 196ی ساڵی 2000.
- 500 دانەی لێ چاپکراوە.

## پێشکەش:

- پێشکەشە بەگیانی پاکی خوالێخۆشبوو ( مەعروف ئەحمەد بەرزنجی ) ی باوکم کەدۆستێکی نزیکی خانی دزلێو شێخی نەمری بەردەقارەمان بوو.
- بەگیانی پاکی رووناکبیرو یاساناسی خوالێخۆشبوو ( عوسمان مەعروف بەرزنجی )ی کاکم کەدەر لەسەرەتای نووسینمەوە ساڵی (١٩٥٩) یەکەم هاندەری نووسینم بوو.

**نووسەر**

شەرتە تا رۆژی قیامەت دەست لەئەژنۆ بەرنەدەم
سەر لەقوڕ نێم بۆ سیادەت بەم دڵەی غەمناکەوە
بۆ دوو مەحموودخان ئەمیری سەرحەدی رۆم و عەجەم
بوونە ئەسحابی قوڕەبەش و چوونە سلکی چاکەوە

حەملی
ئەحمەد بەگی ساحێبقران
1936/11/12 – 1878

# سەرەتایەک بۆ چاپی دووەمی بژارکراو

سەرەتای نووسین وبیرکردنەوە لەم باسە مێژوویی یە دەگەڕێتەوە بۆ لەوروبەری ساڵی ١٩٧٣ کە بۆ یەکەم جار[1]

بەناونیشانی (مەحمود خانی دزڵی ولاپەڕەیەک لە مێژووی کورد ) [2] بابەتێکی مێژووییم لەسێ لاپەڕەی قەبارە گەورەی گۆڤارێکی کوردیدا سەبارەت بە هەندێ لایەنی ژیان و چمکێکی خەبات ورەنج وتەقەلای شۆڕە سواری دلێرو گەورە پیاوی ناوچەی (دزڵی)و(هەورامان) خواڵێ خۆشبوو (مەحمود خانی دزڵی ) بڵاوکردەوە.

ئەو کورتە باسە تایبەتی یەبەپێی تواناو مەودای ئەو ڕۆژگارەو دەست کەوتنی زانیاریو سەرچاوەی باوەڕپێکراو تاڕادەیەک تولنی ببێتە ڕۆشنایی یەکو هۆی تەکاندنی هەندێ تەپو تۆزی ڕۆژگار لەمێژووی ئەو سەردەمە جەنجاڵەی نەتەوەی کورددا. لەهەمان کاتدا بووە جێی متمانەو مایەی پەسەند کردنی خوێندەواران و مێژوو نووسە ناودارەکانی کورد تەنانەت لەنووسینی بابەتە مێژوویی یەکانی دواتردا وەک سەرچاوەیەکی ڕوون مامڵەی

لەگەڵدا کرا،[٣] سەرباری ئەمانەیش زانای مێژوونووس دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لەبیبلیۆگرافیای بابەتە مێژووییەکاندا تۆماری کردووە.[٤] دیارە کەرەستەی بنەڕەتی و بناوانی سەرچاوەی ئەو کورتە باسە وەك لەپەراوێزی بابەتی ناو گۆڤارەکەدا سەرنجی بۆ راکێشراوە لەکاتی خۆیدا زۆربەیانم لەخوالێخۆشبوو (مەعروف ئەحمەد بەرزنجی)[٥] باوکم وەرگرتبوو، کەدۆستێکی نزیکی شێخی نەمری بەردە قارەمان و مەحموود خانی دزلی بوودو لەپاڵ چەند سەرچاوەیەکی دەست کەوتووی ئەوکاتەداو بەهەموویان ئەو باسەی لێ پێکهات و بەنەوازشەوە جێی راستەقینەی خۆی گرت.

بابەتی ناوبراو هێندەی لەوزەو توانستی گۆڤارێکدا بوو بێ توانیبوی تارادەیەك پەل بهاوێژێ و چەردەیەك لەژیان و هەڵسووڕانی بخاتە بەرچاو، بەلام دیارە بەهۆی کزی سەرچاوەو مەودای دیاریکراوی گۆڤارەکەوە لەتوانایدا نەبوو کەبەشێوەیەکی گشتلایی و سەرتاپاگیری لەخانی دزلی بدوێ و بەبەڵگەی مێژوویی دروستەوە کارەکە بگاتە ئەنجام.

دوای بلاوبوونەوەی ئەو باسە تایبەتی یە خولیای رەخساندنی دەرفەت و هەلێکی لەباربووم بەمەبەستی درێژەپێدانی ئەو کارە مێژوویی یەو بەهەناسەو لێدوانێکی قوڵتر کرۆکی تێکۆشان و سەربوردەی ژیانی تایبەتی و بارودۆخی سەرجەم بزوتنەوەو راپەڕین و دۆست و ناحەزانی ئەم گەورە پیاوە لەبیرکراوەی مێژووی نەتەوایەتیمان تۆمار بکەم و نووکی قەلەم بژەنە هەڵسوکەوت و تێکرا بەرنامەی ژیان و جووڵانەوەکانی لەهەردوو بەشی کوردستانی گەورەدا.

دیارە مایەی داخێکی نەبراوەیە کەئەم ویست و خواست و ئارەزووە رستێك تەگەرەو بەرهەڵست بوونە هۆی دواکەوتنی و ماوەیەکی زۆر مایەوە، لەپێش هەموویانەوە کزی و دەست نەکەوتنی سەرچاوەی رۆشنی مێژوویی و (دۆکومێنت)[٦] ی پێویست تابتوانرێ لەبەر رۆشنایی ئەو سەرچاوانەدا بەرگێکی زانستی مێژوویی بەبالای باسەکەدا ببڕێت، چونکە دەمێکە ئەو

راســـتیی‌یه بڕاوه‌تـــه‌وه که‌هــه‌موو لێکۆڵینه‌وه‌یــه‌کی مێژوویـــی دروســـت و تاوتووکردنی بابه‌ته‌کانی‌ئاتاجی سه‌رچاوه‌ی بی خه‌وش و به‌ڵگه‌ی پێویستن.

ئـه‌م خولیـاو تاسـه‌و چاوه‌ڕوانی‌یـه بـێ پشـتیوان مایـه‌وه تاسـاڵی ۱۹۹۳که‌دووبـه‌رگی کتێبێکـی قـه‌باره گـه‌وره‌م که‌وتـه به‌رده‌سـت به‌ناونیشـانی (شێخ مه‌حموودی قاره‌مان و ده‌وڵه‌ته‌که‌ی خواروی کوردستان)[۷] که‌شـاعیرو نووسـه‌ر (محه‌مـه‌د ره‌سول هـاوار) نووسـیویێتی و له‌شـاری لـه‌نده‌ن بـه‌چاپی گـه‌یاندووه‌و لـه‌دووتوێی کتێبه‌کـه‌یدا توانیویێتـی که‌هـه‌ندێ له‌به‌ڵگه‌نامـه‌کانی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی به‌ریتانیا جێ بکاته‌وه‌و له‌به‌ر تیشکی ئـه‌و زانیاری‌یانـه‌دا سـه‌ره ده‌زووی ڕووداوه‌کـان بدۆزێتـه‌وه‌و بـه‌م کاره‌یشـی خزمـه‌تێکی فـره‌ی به‌کتێبخانه‌ی کوردی گه‌یاندووه.

دوای خوێندنه‌وه‌و به‌سه‌ر کردنه‌وه‌ی تێکڕای لاپه‌ره‌کانی هه‌ردوو به‌رگی ئه‌م کتێبه مێژوویی‌یه‌ئێستێکم به‌رامبه‌ری کردو سه‌رنجم‌دا که‌لاپه‌ڕه‌کانی ئه‌م کتێبه به‌شێکی ئاواته دێرینه‌کانمی سه‌باره‌ت به‌لایـه‌نی (دۆکومێنـت) هێناوه‌تـه‌دی. چونکـه هـه‌ندی له‌به‌ڵگه‌نامـه‌ر یادداشـت و سـۆراخه تایبه‌تی‌یـه‌کانی نووسـه‌ر په‌یوه‌ندی‌یـه‌کی سـه‌رو مـڕو پێکـه‌وه لکاویـان بـه‌ژیان و تێکۆشـانی (خـانی دزڵی)یه‌وه هه‌یه‌و له هه‌ر جێگایه‌کدا ئینگلیزه داگیرکاره‌کان له‌شێخ مه‌حموودی به‌رزنجی دوابن یه‌کسه‌ر ناوی (مه‌حموودخانی دزڵی) هاتووه.

سه‌ره‌ڕای ئه‌م سه‌رچاوه‌یه‌ش له‌م سالانه‌ی دوایی‌یه‌دا زانای مێژوو نووس دکتـۆر کـه‌مال مه‌زهـه‌ر ئه‌حمـه‌د زنجیره‌یـه‌ك باسـی مێژوویـی موتوربـه کـراو بمبه‌ڵگه‌نامـه‌ی هه‌مه جـۆر لـه‌گۆڤاره‌کانی (ڕه‌نگین و ڕۆشـنبیری نـوێ و بـه‌یان)دا بلاو کرده‌وه که‌په‌یوه‌ندی‌یه‌کی توندو تۆڵیان به‌کرۆکی مه‌به‌سته‌کانمه‌وه هه‌بوو، ئه‌مه جگه له نووسینه‌کانی ئـه‌م دوایی‌یـه‌ی مامۆسـتایان (مـه‌لا جـه‌میلی ڕۆژ به‌یانی و دکتۆر موکه‌ڕه‌م تاڵه‌بانی و دکتۆر فوئـاد حمـه خورشـید)(۸) و چـه‌ند که‌سێکی تر که‌که‌م و زۆر سوودیان به‌باسه‌که‌مان گه‌یاندووه.

بەم پێیە سەرلەنوێ ئەو خولیایەی پێشووم گەشایەوەو سەرباری ئەم سەرچاوە بەنرخانە جارێکی تر بەگوڕو تین و تاوێکی کاراتر کەوتمەوە کێو ماڵی بناوان و سەرچاوەو بابەتە مێژوویی یەکان بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی، سەرباری ئەمانەیش بەپشتیوانی ڕۆژنامەو گۆڤارو چاپەمەنی یەکانی ئەو سەردەمەو دانیشتن و سۆراخی بەردەوام توانیم لەماوەیەکی دیاری کراودا لێکۆلینەوەیکی مێژوویی بەئەنجام بگەیەنم.

دوای ڕستێك تەگەرەو قۆرتی ناچاری سالی ١٩٩٧ ئەم کتێبە بۆیەکەم جار بەناونیشانی (مەحموود خانی دزلی-شۆڕشگێری نیو سەدەی ڕۆژهەلاتی کوردستان) چاپکراو بریتی بوو لەدوانزە بەشی سەرەکی و لەقەبارەی ١٢٦ لاپەڕەدا بلاوکرایەوە، بەلام بەداخەوە بەژمارەیەکی کەم چاپ کراو نەگەیشتە دەست زۆربەی خوێندەوارانی کورد، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا نووسەران و شارەزایانی ئەم بوارە بەگەرمی یەوە پێشوازی یان لێ کردو لەرۆژنامەو گۆڤارەکان و بەنامەی تایبەتی بەسەرکرایەوەو وەك بابەتێکی سەنگین خرایە بەرچاو.

لەبەرکەمی ژمارەی چاپکراوو نەمانی بەزوویی لەکتێبخانەکاندا خوێندەواران ویلی کتێبەکە بوون و بەردەوام سۆراخیان دەکرد، هەر ئەم هۆیەش بوو کە ماوەیەك لەمەوبەر برای بەریز (کاوەی ئەنوەر بەگی مەحموود خانی‌دزلی) کەئەرکی چاپی یەکەمی کتێبەکەی لەئەستۆ گرتبوو، بەجەختەوە رووی لێنام بۆ چاپکردنەوەی سەرلەنوێی کتێبەکە، بەو هۆیەی کەلەکتێبخانەکاندا نەماوەو لەگەلی لاوە سۆراخی دەکەن، منیش داواکەیم پەسەند کرد بەو مەرجەی کەدەستکاری یەکی بنەڕەتی بکرێ و دوای بژارو تەتەلەو پەرەپێدان و گۆرانکاری یەکی فرەلایەن چاپێکی نوێی بکرێتەوە، دیارە لەدوای چاپی یەکەمی کتێبەکەوە کۆمەلێ زانیاری تر دەستگیر بوون و هەندێ بابەت و بەلگەنامەی مێژووی بەسوود بلاوکراونەتەوە، بۆیە لەماوەیەکی

کورتدا بژارێکی سەرتاپاگیری کتێبەکەم کردو سێ بەشی سەرەکی پێویستم خستە پاڵو لەگەڵ دەستکاری زۆربەی بەشەکانی ترو دوای پۆشتە کردنەوەو مشتومالّ کردنی سەرجەم بابەتەکان بەبەرگو شێوەو کاڵایەکی بەپێز ترەوە بۆ دووەم جار خرایەوە ژێر چاپو لەکۆتایی کتێبەکەیشدا بەشێکی تایبەتی تەرخانە بۆ ئەو بابەتانەی کەسەبارەت بەچاپی یەکەمی کتێبەکە لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە. لێرەدا پێویستە ئەوەیش بڵێم کەلەگەڵ ئەوەکانی خانی دزڵی‌دا لەمێژەوە ئاشنای یەکترینو (کاوەی ئەنوەربەگی) کورە زای هەموو ئامادەیی‌یەکی نیشان‌دا بۆ هاوکاری سەرلەنوێ چاپکردنەوەی بەمەبەستی پر کردنەوەی ئەو کەلەبەرەی کەلەمێژووی هاوچەرخی کوردی‌دا دیارەو بۆ شایی‌یەکەی مایەی رامانو نیگەرانی‌یە، چونکە تائێستا لەهەندێ باسی لاوەکیو پچڕ پچڕی ئەم کتێبو ئەو وتار شتێکی سەربەخۆی لەبارەیەوە نەنووسراوەو کەئاور لەدەوری پڕ شکۆیی بدرێتەوەو وەك زۆر شتی تر خزێنراوەتە خانەی تاریکستانی مێژووی هاوچەرخەوە کەئەمەیش خەوشێکی گەورەیەو لەئەستۆی روناکبیرو نووسەرانی ئەم بوارەیە، سەیریش لەوەدایە کەنووسەرو سیاسیو گەریدەکانی بیانی لەنووسەرانی کورد زیاتر بایەخیان بەدلسۆزیو رەنجو خەباتی ئەم شەخسی‌یەتە داوەو تەنانەت لەیادداشتە چاپکراوو راپۆرتە نهێنی‌یەکانیان‌دا بەرۆلەیەکی نەگۆڕی کورد پەروەرو جەربەزەو دوژمنێکی دێرینی داگیرکارانیان داناوەو ئەوەیان نەشاردۆتەوە کەخانی دزڵی لەبێشکەی دارەوە تا بێشکەی خاك تۆزقاڵێك لەرێ لادان لەبەرنامەی ژیانی‌دا نەبووەو پڕ بەپڕی راستیو دلسۆزی خۆی بەقوربانی ئەم خاکە پیرۆزە کردووە.[٩]

ئێمەش لەم چاپە نوێو بژار کراوەدا بەهیواین کارەکەمان بێتەمایەی رەزامەندیو چمکێکی مێژووی خەباتی نەتەوایەتی کوردمان لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تۆمار کردبێ.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١)کەدەڵێین بۆ یەکەم جار مەبەست لەوەیە کەتائەو کاتە هیچ باس و لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی وەك باسێکی سەربەخۆ بۆ (مەحموود خانی دزڵی) تەرخان نەکرا بوو.

(٢)عومەر مەعروف بەرزنجی، گۆڤاری رۆژی کوردستان، ژ٤ س٢، حوزەیرانی ١٩٧٢.

(٣)بۆ نمونە بروانە: العشائر الكرديه، ترجمه وتعليق فؤاد حمة خورشيد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩، ص١٦.

(٤)کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، مێژوو، چاپخانەی (دار افاق عربيه)، بەغداد، ١٩٨٣، ل٢٩٢.

(٥)مەعروف ئەحمەد بەرزنجی: باوکی نووسەری ئەم کتێبەیە، ساڵی ١٩٠٥ لەناوایی بەرزنجە لەدایك بووە، سەرلەئێوارەی ٥ی مایسی ساڵی ١٩٧٠ لەشاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، خوالێخۆشبوو ئاشناو دۆستێکی نزیك و بەئەمەکی شێخ مەحمودی حەفیدزادەی بەرزنجی و مەحموود خانی دزڵی بووەو شارەزاییەکی تەواوی لەڕووداوو کارەساتەکانی ئەو سەردەمە هەبوو، جگە لەمەیش خوێندەوارێکی بەئاگای رۆژگاری خۆی بوو، لەزمانی فارسیدا شارەزا بوو، سنگی بریتی بوو لەتۆمارێکی‌شیعری شاعیرە چاکەکانی کورد.

(٦)بەداخەوە دۆکومینت لەلای ئێمە هیچ سەنگ و بایەخێکی نییەو پارێزگاری نەکراوە، لەم بارەیەوە دەتوانین مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف وەك تەنیا باڵ بەخەمخۆری مەسەلەکە بزانین، هەرچەندە لەلایەن نەزان و تازەپیاکەوتووەکانەوە بەرەنگاری دەکرێ، مامۆستا (مەحموودی مەلا عیزەت)یش کارێکی سەنگینی بەئەنجام گەیاند بۆ کۆکردنەوەو پاراستن و چاپکردنی دۆکومینتەکانی سەردەمی دەوڵەتی‌جمهوری کوردستان، بۆ ئەمەیش بروانە: دەولەتی جمهوری کوردستان، نامەو دۆکومینت، بەرگی یەکەم، سوید،ئازاری ١٩٩٢، بەرگی دووەم، ١٩٩٥.

(٧)ئەم کتێبەی نووسەر لەدووبەرگی قەبارە گەورەدایەو بەرگی یەکەم، ١٩٩٢، بەرگی دووەم،١٩٩٥

بایەخی گەورەی ئەم کتێبە لەوەدایە کەبەزۆری پشتی بەستووە بەبەڵگەنامەو راپۆرت و گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی ناسراوی وەك خوالی خۆشبوو شێخ باباعەلی شێخ مەحموودو زۆری تریش.

(٨)دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی لەم ساڵانەی دواییەدا چەند باسێکی مێژوویی و سەربوردو یادداشتی تایبەتی بڵاوکردەوە کەدەبنە سەرچاوەی روونی نووسینەوەی مێژوو بەتایبەتی بابەتی (مەحمود خانی دزڵی-م چۆن ناسی)و(چمکێك لەژیانی جافەرمانی هەورامان) کەلەگۆڤاری (رەنگین)دا بڵاوی کردنەوە.

(٩)بۆ ئەم راستی بروانە: العشائر الكرديه، ترجمة وتعليق فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩، ص١٥،١٦.

## وتەی بنەماڵە

### کاوەی ئەنوەر بەگی مەحموود خانی دزڵی

کورد وەك نەتەوەیەكی پەرەوازەو چوار مێخە كراوی رۆژهەڵات لەبەرەبەیانی مێـژووی ژیـانو سـەرهەڵدانی یەوە لاپەڕەكانی سـەرڕێژن لەكەسـانی جوامـێرو خەباتكارو خـاوەن پایـەو دەسـەڵاتی سیاسـیو كۆمەڵایـەتیو بوارە گەشـەكانی ژیـانو زنجیرەیـەكی نەپسـاوی شـۆڕشو راپـەڕینو جۆشـدانی خـەبات، بـەڵام چونكـە رۆژگـار لەگـەڵیدا نـەگونجاوەو بـەدرێژایی مێـژوو نوقمـی مەینـەتیو سـەرگەردانی كـراوەو بـۆی نـەلواوە كەبەشـێوەیەكی دروسـتو بـەپێی بەرنامەیەكی دارێژراو لاپەڕە رۆشنەكانی مێژووی ژیانی تۆمار بكاتو ئەڵقەی خەباتی خوێناویو رایەڵەكانی پێكەوە بلكێنن. بەم هۆیەوە لاپەڕەكانی گومناو كراونو بیرچوونەتەوەو زۆر جاریش شێوێندراونو ناوو سەربووردەیان لەسەر نەخشە سڕاونەتەوە.

لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا خوالێ خۆشبوو (مەحموود خانی دزلی) باپیرم کەسەرداری هەورامان و یەکێك بووە لەو ڕۆڵە دلێرانەی کەلەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە تائەوساتەی بەدەستی دوژمنانی دێرینی کورد ژەهری دەرخوارد دراو سەری هەمیشەیی نایەوە نمونەیەکی ڕەزاسوکی گەردن کەشی دەسەلات و دڵسۆزی و قوربانی‌دان بووە، زنجیرەی خەبات و ڕاپەڕین و بەرهەڵستکاری لەباشوورو ڕۆژهەلاتی کوردستاندا لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیادا تۆمار کراون و باشترین شایەتی سەربەمن.

مایەی نیگەرانی‌یە کەئەم قارەمان و خزمەتگوزارە بەدیمەنە بەپێی پێویست ورازی بوونی ویژدان و بەمەبەستی پۆشتەکردنەوەی لاپەرەکانی مێژوو ئاوڕی هۆشمەندانەی لێنەدراوەتەوەو لەنەزانینەوە هەندێ جار هەوڵ وتەقەللاو رەنجی چەند سالەی لێزەوت دەکری‌وماڧی رەوای نادرێتێ، تەنانەت لەم ڕۆژگارە نوێ‌یەو سەردەمی شنەی ئازادی‌و بوژاندنەوەی گیانی نەتەوەیی‌دا جاروبار دەبیستین و دەبینین کەهەندێك لەبەرپرسانی سیاسی‌و کاربەدەستانی کورد رێیان دەکەوێتە مەڵبەندو زێدو مەئوای خانی دزلی‌و بەدرێژی‌و پانی ناوچەی هەورامان دێن و دەچن و پەنجەی ستایش دەکەنە کەسانێك کە لەرۆژگاری خۆیاندا تەنانەت بنەماڵەو دراوسێ‌کانیشیان بەباشی نەیان ناسیون، لەکاتێکدا کە ئارشیڤی دەزگا جۆربەجۆرەکانی بەریتانیاو کۆشکی شاهانەی عیراق و شوێنەکانی‌تر سەر ریژن لەبەڵگەی ئازایی‌و نیشتمانپەروەری خانی دزلی، بۆیە ئێمە وەك بنەماڵەی (خانی دزلی) دەمێکە بەئەلهاو خوشنودی‌یەوە چاوەروانی قەڵەمیکی بە برشت ودلسۆزبوین کە بتوانێ تالی روداوەکان

کۆبکاتەوەو باسێکی مێژوویی هاوچەرخ بخاتە بەردەم ڕۆڵەکانی کوردو بۆشایی‌یەکی سەرنج ڕاکێش لەم بوارەدا پڕبکاتەوە.

دیارە ئەم چاوەڕوانی‌یە بەری گرت و مامۆستا (عومەر مەعروف بەرزنجی) کەلەدەمێکەوە دۆستی نزیکی بنەماڵەکەمانە ئاگاداری کردین کەبەپێی توانای دەسکەوتنی بەڵگەو ڕەخساندنی دەرفەت باسێکی تایبەتی ئامادەکردووەو پێویستی بەهاوکاری و دەستگیرۆیی چاپ و بلاوکردنەوە هەیە، ئێمەش بەخۆشحاڵی‌یەوە بەرەو پیری چوین و هەوڵ و ماندووبوونەکەیمان بەقەدرو سەنگینی‌یەوە وەرگرت و بەش بەحاڵی خۆم لەگەڵ ئەوەشدا کەرستێك گرفت و تەگەرە لەبەردەممدا قوت کرابونەوە بەشانازی‌یەوە ئەرکی چاپ و بلاوکردنەوەم لەئەستۆ گرت، ئەم کارەش ناگەڕێتەوەبۆ ئەو مەبەستە تایبەتی‌یەی کەبریتی‌یە لەتۆمارێکی سەرتاپاگێڕی مێژووی ژیان و دەسەلات و خەباتی (خانی‌دزڵی) باپیرم،بەڵکو هۆکەی بۆ ئەو سەرچاوە بێ خەوشە دەگەڕێتەوە کەئەم کتێبە لاپەڕەیەکی ڕۆشنی نەتەوەی کوردەو پێویستە بەو پەڕی نوازشەوە بلاوبکرێتەوەو بەزیندوویی بمێنێتەوەو ئەڵقە ونبوەکانی ڕابوردوو سەرلەنوێ بژاربکرێت و بهۆنرێتەوە، بەم بۆنەیەوە جارێکی تر دەیڵێمەوە کەئەرکو ماندووبوونەکەی مامۆستای نووسەر لەسەرچاوانەو خۆشحاڵین کەدیاری‌یەکی بەئەمەکی خەبات وڕاپەڕین و دڵسۆزی بەشێوەی کتێبێکی خنجیلانەو سەربەخۆ دەخرێتە کتێبخانەی کوردی‌یەوە.

## بەشی یەکەم

# ئاوردانەوەیەکی مێژوویی

مێژوو وەك زانستو پشکنینو هەوڵدان بۆ تۆمارکردنی ڕووداوەکانی نەتەوەو پەند لێوەرگرتنو توێژینەوەیان بەپێی نەخشەو پلانو بەرنامەیەکی داڕێژراو لەڕۆژگاری ئەمرۆدا بایەخێکی فرەی بەخۆوە گرتووەو بووەتە جێی تێڕوانینو بەسەرکردنەوە، لەم ڕێگەیەوە گەلێ شتی شاراوەی بەنرخو کۆنو قوژبنی ڕۆژانی دێرین ڕۆشن دەکاتو بەچەشنی کەرەستەیەکی سەنگینو بەهادار دەبێتە مایەی شانازی ڕۆڵەکانی نەتەوەو بگرە ئاوێنەیەکی بالانمای پیشکەوتنو خەملاندنی کاروباری ژیانە لەڕووی سیاسیو کۆمەلایەتیو ژیاریو بەنرخترین هەوێنی نەبزرکاوی مێشکی ئادەمیزادە.

گەلانی بەرێ کەوتووی کاروانی شارستانیو پێشکەوتنو بەخۆداهاتوو دەمێکە ئاوڕیان لەمێژووی دوورو نزیکی خۆیان داوەتەوەو کەوتوونەتە کێومالو تۆمارو بژارو هەڵسەنگاندنو نرخ برین، بەلام لێرەدا دەپرسین ئاخۆ(مێژوو بۆی کراوە کەلەگەل ژیانی گەلی کورد تاوەکو ئەمڕۆ بگونجێو بەچ

جۆریك توانیوێتی سەرگورشتەی ئەم گەلە لەقەڵەم بداتو چ وێنەیەکی بۆ گرتووە؟)[1]

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەو بەمەبەستی زیاتر ڕۆچوونو بەپێی ئەو کەرەستەو زانیاریو شوێنەوارو سەرچاوانەی لەبەردەستدانو نووسراونەتەوە دەتوانین بەبێ سڵەمینەوەو گوێپێدانی هیچ تەگەرەیەك، ڕایەکی دروستو دوور لەسۆزیکی هەڵچووی تایبەتی دەربڕینو یەکسەر بڵێین کەمێژووی ڕاستەقینەی تۆمارکراوی ئەم نەتەوەیە بەراستەوخۆ بەگوێرەی ڕیرەوو بەرنامەیەکی گونجاو لەگەڵ قۆناخەکانی ژیانی کورددا نەهاتووەو زۆرجاریش تەمو مژو پەردەیەکی لێڵ باڵی بەسەر چمکێکی مێژووی کۆنو هاوچەرخی نەتەوەدا کێشاوەو تەنانەت هەندێ بەسەرهاتو ڕووداوی ڕۆژانی نزیکیش لەسربوونو شێواندن قوتاریان نەبووەو خزێنراونەتە گۆشە تاریکەکانی لەباربردنو کەلاخستنو وێنەیەکی نەخشاوی کۆمەڵگای کوردەواری نیشان نەدراوەو ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕستێك هۆی تایبەتیو گشتی.

ڕاستە لەقۆناخەکانی بەراییو سەرەتای هۆشو خوێندەواریدا دڵسۆزانی وەك (شەرەفخانی بدلیسیو ئەمین زەکی بەگو حسێن حوزنی موکریانیو حسێن ناظمو ساڵح قەفتان) و لەم نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەیشدا نووسەرانی وەك(ڕەفیق حیلمیو عەلائەدین سەجادیو مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانیو دکتۆر کەمال مەزهەرئەحمەدو دکتۆر جەمال نەبەزو دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکرو دکتۆر جەمال ڕەشیدو دکتۆر جەبار قادرو دکتۆر فوئاد حەمە خورشیدو عەبدولرەقیب یوسفو نەوشیروان مستەفاو زبیر بیلال ئیسماعیل)و کەسانیتر لەم بارەیەوە ڕەنجی فەرهادانەیان داوەو جێدەستیان بەئاسانی دەناسرێتەوە، بەڵام مێژووی نەتەوەیەکی لەتو پەت کراوو چوارمێخەکراوی ژێردەستەی وەکو کورد کەلەهەموو قۆناخەکانی مێژووی

دێرین و هاوچەرخی‌دا داگیرکاران بەگیان و دڵ و بەنەخشەو بەرنامەی دیاریکراو هەوڵی لیخن‌کردنی سەرچاوەی بەسەرهاتەکانیان داوەو تاڵە دەزووی نێوانیان پچڕاندووە، پاك کردنەوەو نووسین و دەرخستنی رووی گەش و تۆمارکردنی مێژوویەکی سەرتاپاگیڕی قەڵەمی بەبڕشتی زیاتر دەوێ. سالی ١٩١٣ (دکتۆر عەبدوللا جەودەت)[٢] لەگۆڤاری (ڕۆژی کورد)[٣]دا دەپرسێت و دەڵێ(ئایا کورد مێژووی هەیە؟)[٤]هەرخۆیشی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: (بەتەنیا شەرەفنامەیەك میللەت ناتوانێ شەرەفی مێژووی بپارێزێ).

چونکە جێگەی نکوڵی نی‌یە کەکورد وەك نەتەوەیەکی دێرینی ڕۆژهەلات خاوەنی رابردوویەکی سەرڕێژی خەبات و راچەنین و بڕواو هیوایەو بەگوێرەی بارودۆخی ڕۆژگاریش چەند لاپەرەیەکی بەخوێن و فرمێسك و ئێسك و پروسکی شەهیدانی گومناو و رووباری خوێن نەخشاندووە، بەدرێژایی مێژووش سەرباری شکست و هەڵەنگوتن بەباوەڕی نەگۆڕو هیوای بەردەوامەوە رووی لەئاسۆی سەرفرازی کردووە.

دەمێکە کورد خاکە پیرۆزەکەی بەپلانی ئیمپریالیزمی جیهانی لەت‌وپەتکراوەو هەر پارچەیەکی بووە بەپێخۆری دەوڵەتیکی درندەی چاوسووری دڵ پڕلەقین، راستتر لە(دوای جەنگی چاڵدێرانی ١٥١٤ی نیوان دوو ئیمپراتۆری‌یەتە رەشەکەی عوسمانی و سەفەوی هێڵی دابەشکردنی بۆ کێشراوەو لەسالی١٦٣٩دا بەپێی پەیمانی- ئەرزرۆم-ی نێوانیان کوردستان بەشێوەیەکی رەسمی لەت و پەت کرا، دیارە ئەم سنوورانەی ئەمڕۆش بەرهەمی ئەوپەیمانە نهێنی و پلانە گڵاوەی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسایە کەلەساڵی ١٩١٦دا لەنێوان ئینگلیزو فەرەنسەدا بۆ دابەشکردنی میراتی پیاوە نەخۆشەکەی تورکیا بەستراوەو دواتریش رووسەکان خۆیان تێ‌ڕۆکرد کەبەپێی پەیمانی - سایکس پیکۆ-ی بەدناو ناسراوە. کەواتە رەنگ ڕێژو

ئەندازیارو بنیادنەرو تەلبەندکەری ئەوسنوورانەی ئەمڕۆ ئیمپریالیزم بووەو جێبەجێکەرو پاسەوانیشی هەر ئەو رژێمە ئەڵقە لەگوێو دەسەندە خۆرانەی ئیمپریالیزم بوونو پارێزەرانی ئەمڕۆیشی لەهەرلایەك بنو هەرناوێك لەخۆیان بنێن ئەو گەراترووکاوەی ئیمپریالیزمن کەناو بەناو بەرگی کوردی لەبەرئەکەنو رەنگی پێشکەوتنخوازی لەخۆیان هەڵدەسوون) [*]، جانەتەوەیەکی پەژمردەی وەك کورد کەهەستی بەودابرانو ستەمو لێقەوماوی‌یە کردبێ لەوزەو توانای‌دانەبووە کەسستی تەنگی پێهەڵچنیو رۆژگار برواو ئومێدی بڕاکێنێ، بۆیە بەدرێژایی مێژووی ژیانی لەهەمو پارچە لەتوپەتکراوەکانی کوردستانی گەورەدا شۆڕشو راپەرینو رازی نەبوون بەو ژیانە تاڵەی کەهەیە بەرنامەی هەمیشەیی رۆڵەکانی بووەو ئەم بزوتنەوانە زنجیرەیەکی توندو تۆڵو نەپساویان پێکهیناوە،راستە ئەم راپەرینو شۆڕشو جۆشدانە شۆڕشگێرانەیە هەریەکەیان بەپلانو کۆمەکی داگیرکارانو ئیمپریالیزمی جیهانیو ناوبەناویش بەپاڵپشتی خۆفرۆشانی ناوخۆ سەرکوت کراونو نەهێڵراوە کەگوڵی هیوایان بگەشێتەوەو بگەنە خواستی رەوایان، بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین راپەرینو شۆڕشەکانی (شەمزینانو ئاراراتو وانو بایەزیدو بارزانو شێخ مەحمودی حەفید زادەو سمکۆی شوکاكو مەحمود خانی دزلیو سەردار رەشیدی ئەردەلان) و لەبارچوونی میرنشینەکانی(ئەردەلانو بابانو سۆرانو بادینان) بەبەلگەی ئەم بۆچوونە دابنێین. بەلام لەهەمان کاتدا ئەوەیش راستە کەبەهۆی گڕوتینی ئەم هەستە نەتەوایەتی‌یەوە کورد توانیویەتی بەسەربەرزیو گەردن کەشیبوونی خۆی بسەلمێنێو شوناسنامەی نەتەوەیی بزر نەکات.

***

لەکوردستانی بەزۆر بەستراو بەئێرانەوە یان بەواتایەکی راستتر رۆژهەڵاتی کوردستان لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەوە بڵێسەی ئاگری شۆڕش‌و راپەڕین‌و خەباتی نەپسـاو زەوی‌یـە پـان‌و بەرینەکـەی گرتـەوەو سـەرەك عەشـیرەت‌و رێکخراوە سیاسی‌و شۆڕشگێرە نەبەردەکان هەریەکەو لەشوێنێك بارگەو بنەی داگیرکارانیان پێچایەوەو خەرمانیان کردن بەسووتووە. من لێرەدا نامەوێ نووکی قەڵەم بژەنمە سەرجەم شۆڕشەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان‌و لەسەرەتای سەرهەڵدان‌و بنەتای شکست‌و پەرەوازەبوونیان بدوێم‌و لێیان بکۆڵمەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم کەئەم بەشەی کوردستان لەمێژە مەڵبەندی بزووتنەوەو کاری شۆڕشگێڕانەبووە، لـەولاتی- شـوکاکی بنـاری- زۆزان- شەخسـی‌یەتێکی بەدیمەن‌و شۆڕشگێڕێکی لێهاتووی وەك (سمایل خانی شوکاك)[6] لەرۆژگاری جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە ئاووشۆرەت‌و دەنگی شۆڕشی گەیشتە سەرجەم ناوچەکانی کوردستان‌و سەرکردایەتی شۆڕشێکی دلێرانەی کردو ماوەیەکی زۆر حوکم‌و دەسەڵاتی ئێرانی هێنابووە لەرزین‌و هەژان‌و دواجار بەنامەردانە خوێنی ئاڵی رژا،(لەپایزی۱۹۳۱یشدا کاتێك شێخ مەحمودی حەفید زادە لەناوچەی سلێمانی ژیلەمۆی دامرکاوەی شۆڕشی گەشاندەوە ئالەم کاتەدا کوردەکانی هەرێمی هەمەدانیش بەسەرۆکایەتی-جافەرسان-ی سەرۆکی هەورامان ئالای شۆڕشیان دژی حکومەتی دیکتاتۆری رەزا شا هەلکرد، کوردەکان مەردانە پەلاماری لەشکری ئێرانیان‌داو دۆلەکانی-هەورامان-یان بەلاشەی ئەفسەرو سەربازی ئێرانی پڕکردەوە)[7].

(لەسالانی ۱۹٤۱-۱۹٤٤دا حەمەرەشیدخانی بانە ناوچەکانی بانەو سەردەشت‌و سەقزی گرتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، سەرئەنجام ئەرتەشی ئێران بەهاندانی ئینگلیزەکان‌و یارمەتی هەندێ عەشایەری کورد هێزەکەی خانیان لەکەلخان شکاندو بەناچاری پەنای بۆ عیراق برد)[8] وحکومەتی تاران

دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەکاندا سەپاندەوە (لەبەهاری ١٩٤٣دا تیرەو ئێلەکانی ناوچەی ورمێ بەسەرکردایەتی عومەرخانی شەریفی، زیرۆبەگی بەهادۆری، رەشید بەگی جیهانگیری، تەها بەگی هەرکی، بەهەندێ داخوازی عەشایەری‌و نەتەوایەتی‌یەوە دێهاتی ناوچەکەیان گرتە ژێر دەست‌و ئابلووقەی شاری -ورمێ-یان دا تارووسەکان کەوتنە ناوبژی‌و لەگەڵ -تاران-دا یەکیان خستنەوە)[9] هەروەهالە(١٦ی ئەیلوولی١٩٤٢دا کۆمەڵەی ژێ-کاف دامەزرێنرا بەدروشمە نەتەوایەتی‌یە مێژوویی‌یەکەیەوە- رزگارکردنی کوردستانی گەورە- هاتە سەرشانۆی سیاسی کوردستان، لەدوایی دا هەرلەشوێنەواری ئەم ریکخراوە- حیزبی دیموکراتی کوردستان- دامەزرێنرا)[10] ئەمە جگەلەشۆرش‌و راپەرینەکانی ناوچەکانی مەریوان‌و دزلی‌و هەورامان‌و سنەو حەسەناوا‌و شوێنەکانی‌تر کەبەسەرکردایەتی (مەحمود خانی دزلی‌و مەحمود خانی کانی سانان‌و سەردار رەشیدی ئەردەلان)بووە کەهەریەکەیان بۆ سالانیکی دوورودرێژ هەر رۆژەی لەشوێن‌و پێدەشت‌و لاپالێکەوە رژێمی ئێرانیان هەراسان کردبوو، لەئەنجامی ئەم هەلمەت‌و پەلاماردانەدا زۆرجار دەسەلاتدارانی ئێران دوای بەکارهینانی ئەوپەری توندو تیژی‌و سیاسەتی تالان‌و قرکردن بەناچاری داوای رێککەوتنی لێکردوون‌و ئابتوانێ لەورێگەیەوە ئەم هەستە نەتەوایەتی‌یە خەفە بکات‌و شوێنەکانی‌تر نەگرێتەوە.

نامەی دەسەلاتدارانی ئینگلیزو فەرماندەکانیان‌و کاربەدەستانی ئێران سەبارەت بەبارودۆخی ئەوسەردەمە باشترین بەلگەی زیندووە سەبارەت بەکاریگەرێتی ئەو شۆرشانەو لێرەدا تەنیا نامەی فەرمانده‌یەکی ئینگلیزەکان دەخەینە بەرچاو: ئەفسەری ئینگلیزی- مێجەر روس-لەنامەیەکی‌دا کەلەمانگی ئابی سالی ١٩١٩دا بۆ کاربەدەستانی ولاتەکەی ناردووە تیایدا دەلێ: (ئەگەر ئینگلیز بەتوندی لەگەڵ کوردەکانی ئێراندا نەجولێتەوە کوردەکان حکومەتی

ئێران دەرووخێنن‌و داوای کردووە کەبەرهەڵستی ئەم شۆڕش‌و ڕاپەڕینانە بکرێت)[11] دیارە ئەم نامەیەی- مێجەر ڕوس-و دەیان نامەی‌دواتر لەئەنجامی ئەوبزوتنەوە دلێرانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە بەفەرماندەیی(سمایل خانی سمکۆو مەحمودخانی دزلی‌و مەحمود خانی کانی سانان‌و سەردار ڕشیدی ئەردەڵان‌و جافەر سانی هەورامان‌و حەمە ڕەشید خانی بانە)و زۆری تریش.

***

ئێمە لەم کتێبەداو لەدووتویی بەشەکانیدا دەمانەوێ لەیەکێك لەوشۆڕشگێڕانە بدوێین کەلەڕۆژهەڵاتی کوردستان‌دا شەخسی‌یەتیکی ناسراوو بەدیمەن بووە کەئەویش خوالێخۆشبوو(مەحمود خانی دزلی)یە.

چونکە مەحمود خانی دزلی بۆماوەی نیوسەدە لەڕۆژهەلات‌و باشووری کوردستان‌دا کاراترین دەوری بینی‌و دواجاریش بەرووسووری ژیانی بەجێهێشت‌وچووەریزی نەمرانەوە.

مەحمودخانی دزلی وەك سەرۆك عەشیرەت وخاوەن هەستێکی پیرۆزو رەوشتیکی نەبەردانە لەرۆژگاریکی جەنجالی پر لەتەم‌و مژی ئەم نەتەوەیەدا چاوی کردووەتەوەو بەردەوام ستەم‌و زەبروزەنگی (قاجاری‌یەکان)[12]و (رەزاخانی مازەندەران)[13]و (حەمە)[14]ی کوڕی‌و فروفێڵی ئینگلیزەکانی بینیوە، بۆیە لەسەرەتای هۆش‌و بیرکردنەوەیەوە بەچەشنی رۆڵەیەکی لەخۆبوردوو بەخۆی‌و عەشیرەت‌و بنەماڵەو جەنگاوەرەکانی‌یەوە وەك هێزێکی بەرهەڵستکاری نەترس‌و خاوەن بڕوا بەرەورووی دوژمن‌و ناحەزانی نەتەوەکەی وەستاوەو لەم رێگایەشدا زنجیرەیەك ئازارو ئەشکەنجەو نەبوونی‌و بەرداو بەردەو راونان‌و ئاوارەیی‌و کونجی زیندانەکانی ئێران‌و عیراق‌و هیندستانی بینیوە، بەلام ئەمانە نەبوونە بەرهەڵست‌و نەیان توانیوە هێلی راستی لی‌بگۆرن‌و هەلوێستی مەردانەی لەق بکەن، بەپێچەوانەوە خۆی‌و جەنگاوەرە دلێرەکانی

بووبوونە چقڵێکی تیژو چەقیوونە ناوچاوو دڵو دەروونــی فـەرمان ڕەوایـانی دوژمنی گەل.

خـانی دزڵـی وەك شەخسـیـەتێکی بەهەڵوێسـتو دەرکــەوتووی ناوچەکـە لەدوبــەرەدا ســەرقاڵی خــەباتو جــەنگێن بــوو، لەلایەکــەوە دژی ســتەمی کۆلۆنیـالیزمی ئینگلــیزی لــەعیراقداو لەلایــەکیترەوە بەرانبــەر سیاســەتی کۆنەپەرستانەی دەسەلاتدارانی ئێران وەستابوو.

گەربەوردی لەژیانو هەلسورانی خانی دزلی بکۆڵینەوە ئەو ڕاستییە بەدی دەکەین کەخەباتو تیکۆشانی لەمێژووی هاوچەرخی کورددا ڕستێك دیاردەو خاسییەتی نوێی پێوە لکاوەو لەپێش خانی دزڵییەوە بەدی نەکراوە:

- مەحمودخانی دزڵی یەکەم فەرماندەی ڕاپەڕیوی کوردە لەسەرتاپا مێژووی ئەم نەتەوەیەدا کەلەپاڵ خەباتی خوێناوی‌دا دژی ستەمکارانی ئێران بەگەرمیو ئەوپەڕی لەخۆبوردنەوە بـەهانای (شـیخ مـەحمو دی حـەفید زادە)وەهـاتووەو گەیشتووەتە دەشتو بنارو لاپاڵو چیا سەرکەشەکانی باشووری کوردستان. لەمایسـی١٩١٩بەدواوە کەشـاری سـلێمانی ڕزگـارکرد تادەورووبــەری جــەنگی ئاوباریکی‌ساڵی١٩٣١لەسلێمانیو قەرە هەنجیرو دەربەندی بازیانو شارەزوورو هەڵەبجەو خورماڵو بەرزنجەو پێنجوینو عەبابەیلیو ناوچەکانی‌تر جەنگاوەو لەبەشێکی‌تری کوردسـتانی گــەورەدا هەڵسـووڕاوە، دیــارە ئــەم هەڵوێســتو بیرکردنەوەیە لەهەستێکی قووڵی نەتەوایەتی‌یەوە چەکەرەی کردووەو بـاوەڕی نەگۆڕی بەیەك پارچەیی کوردستان بووەو سنووری دەستکردی داگیرکـارانی پێشێلکردووە.

- خـانی دزڵی لەپێشرەوی ئەوسەرکردانەدابووە کەزیرەکانــە پــەی بەجـەنگی پارتیزانی بردووەو بــەرێگاو چارەســەرێکی دروســتی زانیــوە بـۆ بـیزلرکردنو پرزەبرانو لەپەلوو پۆخستنی هیزەکانی دوژمن، ئەوەتا لەکاتێکدا کەلەجەنگی بەرەیی(دەربـەندی بازیـان)داو لـەپاڵ سوپاکەی شیخی بـەردەقارەماندا بـەهۆی نابەرانبـەری هێزەکـانو هــەندێ هەڵەی جەنگیو سـەربازی‌یەوە شکست دێنـن، خانی دزڵی لەهەلەوخالە خراپەکانی جەنگی بـەرەیی تێدەگاتو بەپێی توانـاو

مـەودای ئـەوڕۆژگارە پشـت دەکاتـە جـەنگی بـەرەیی و لەشـێوەی جـەنگی پـارتیزانیدا لەناوچـە جیاوازەکـانی ئـێران و عـیراقدا دوژمنـانی پەریشـان کردووەو ئەم راستیيانەیش لەراپۆرتە نهێنییەکانی ئینگلیزەکاندا بەئاشکرا دیارن:

- خـانی دزلـی یەکـەم سـەرەك عەشـیرەت و فـەرماندەی کـوردە لـەقۆناخێکی دیـاریکراوی مێژوویـیدا کەلـەپاڵ خـەبات و هاوکـاری شـێخینەمری بـەردە قارەمـاندا سـەرجەم ئـەرك و پێویسـتی و مەسـرەفی جـەنگی لەسـەر خـۆی بێوبەچەشـنی کـارو ئەرکێکی پـیرۆزی نەتەوایـەتی مامەڵـەی کردبـێ. لـیرەدا راست وایە کەوتـەی شایەتێکی سەردەم تۆماربکەین کە(ئەحمەد خواجا)یـەو سەبارەت بەسالی ١٩٢٤ دەڵێ:(پاش نیوەڕۆ لەدزلی گەرامەوەو شەولەپارەزان بووم وتیان لەشکری مەحمودخان ئیمڕۆ لێرەدا رابورد، لەپێش گەیشتنەوەی ئێمـەدا مـەحمودخان و لەشـکرەکەی گەیشـتبوونە کـانی سـاردو کارەسـاتی بینراوەکانم بۆ مەلیك گێڕایەوە- لێرەدا مەبەستی شیخ مەحمووده-فـەرموی دیوی خۆمە، پاش دوو رۆژیش حەمە رەشید بەگی وەیسە لەسەر راسپاردەی خانی دزلی بەلەشکرەوە گەیشتەکانی ساردو لەشکری هەورامی ١٢٠٠چەکدار لەبن دارو دەوەنی کانی ساردا بلاوبوونەوە، لەسەرفەرمانی مەلیك بۆ مـەحموود خان و حەمە رەشید بەگ هەریەکەیان ١٠٠لیرەی زێڕم بۆ بردن، حەمەرەشید بەگ بەکەمی زانیو وەرنەگرت، بـەلام مـەحمودخان پاش وەرنـەگرتنی وتـی: لەباتی ئەوەی ئیمە بەبارقرانی ئێرانی بهێنین بـۆ شـێخ مـەحمود ئـەولیرەمان دەداتێ یـەك لیرەی هەڵگرت و ماچی کردو ٩٩لیرەکەی دایەوە دەستم و وتـی ئایا دەبێ بەگیرفانی بۆش هاتبم؟)[10] دیارە ئەم شایەتییەی ئەحمەد خواجا وەك چوری شیر ئەو راستییە دەسەلمێنێ کەمە بەست و کرۆکی هەڵسووڕانی خانی دزلی سەرەتا و بنەتاکەی بۆ خزمەتی کوردو خاکە لەت و پەت کراوەکەی بۆوە ئێمەیش لەبەشەکانی ئەم کتێبەدا چەپکێ تیشك و رۆشنایی دەخەینـە سەر ژیان و مێژووی ئەم گەورە پیاوەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی یەکەم:

١)دکتۆر ئەحمەد عوسمان، دەفتەری کوردەواری (گۆڤار)، بەرگی یەکەم، کانوونی دووەمی ١٩٧٠، ل٨٥.

٢)دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت لەئەیلولی سالی ١٨٩٦دا لەشاری (عەرەبکیر)لەباکووری کوردستان لەبنەماڵەیەکی ناودار کەبە(عومەر ئۆغلۆلەری)ناودەبرا لەدایک بووە، لەکانوونی دووەمی سالی١٩٢٥دا واتا مانگێک پێش راپەرینە مەزنەکەی شێخ سەعیدی پیران رۆژنامەکانی تورکیا بەتایبەتی رۆژنامەی (ئەخشام)بە(بیرکردنەوە لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ تاوانبار کرا).

دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت سالی ١٩٣٢کۆچی دوایی کردووە.

(بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم رووناکبیرە گەورەیە بڕوانە بابەتێکی دکتۆر جەبار قادر-گۆڤاری کاروان ژ٣٧-هەولێر، ١٩٨٥.

٣)رۆژی کورد(گۆڤار)،ژ١، سالی١٩١٣.

٤)دکتۆر جەبار قادر لەباسیکی گرنگیدا بەناونیشانی(روناکبیری کورد عەبدوڵڵا جەودەت) لەم بارەیەوە دەڵێ: (مەبەستی کتێبی مێژووە کەسەبارەت بەکورد نوسرابێ و لاپەرەکانی مێژووی کوردی روون کردبێتەوە)بۆ ئەمەیش بڕوانە: گۆڤاری کاروان، ژ٣٧، هەولێر، ١٩٨٥.

٥)ئازاد مستەفا، مامۆستای کورد(گۆڤار)، ژ١٧،١٨،بەهارو هاوینی ١٩٩٣،ل٢٤(ئەم پەرەگرافە دوای هەندێک کورت کردنەوە وەرگیراوە).

(پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێین کەچاڵدیران دۆڵێکە لەنزیك شاری تەورێزەوە،تیایدا گەورەترین شەر لەنێوان فارسە سەفەویەکان و عوسمانییەکاندا رووی‌داو لەئەنجامیشدا عوسمانییەکان سەرکەوتن وشەرەکەیش هەربەناوی ئەو دۆلەوە ناونراوە) بۆئەم زانیارییە بڕوانە:

مەحمود مەلا عیزەت،کۆماری میللی مەهاباد، ١٩٨٤، ل٣٠.

٦)سمایل خانی شوکاك (سمکۆ)کوری محەمەد ئاغای شوکاکی‌یە، سالی ١٨٧٥لەدایك بووە، لەبنەرەتدا لەتیرەکانی (میلانی)یو لەدیاربەکرەوە هاتوونەتە رۆژهەڵاتی کوردستان، لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە ناوبانگی دەرکردووە، حکومەتی ئێرانی قاجاری و

تورکیای کەمالو عێراق زۆر هەوڵیان داوە کەئەم قارەمانە لەناوبیەن بەلام لەشکری کوردستان بەفەرماندەی سمایل خان کوشتارێکی زۆری لەمەر سێ دەوڵەتەکە کردووە، رەزا شاو کەمال ئەتاتورك بەبیستنی ناوی سمایل خان ترسیان لێدەنیشت، ناچار ئەتاتورك لەسەرەتادا خۆی بەدۆستی نیشان دەدا تاکۆتایی شەری تورکیاو یۆنان هاتو دوایی کەوتە تەقەلادان بۆ لەناوبردنی. ئاواتی سمایل خان رزگارکردنی کوردستان بوو، بۆیە لەشوباتی ١٩٢٣دا دیدەنی شێخ مەحموودی حەفید زادەی کرد لەسلێمانیو ئەم هاتنەیشی سەبارەت بەدروستکردنی حکومەتی کوردستانی گەورە بوو، ئەم قارەمانە لەتەمموزی ١٩٢٢دا دەسەلاتی گەیشتە ناوچەکانی (شاهین قەلا)و (سەقز)و پەیوەندی لەگەڵ ناوچەکانی (هەورامان)و (مەریوان)دا پتەوکرد. لەنیسانی ١٩٣٠دا بەپلانی رەزا شا لەشاری شنۆ شەهید کرا، لەنێوان سمایل خانی سمکۆو خانی دزلیدا دۆستایەتی یەکی بەتین هەبووە، هەرچەندە لەشکریان تیکەڵ نەبووەو پیکەوە نەجەنگاون، دیارە یەکێك لەهۆیەکانی دەگەرێتەوە بۆ دووری ناوچەی دانیشتنی هەردوولایان.

٧)دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی، رەنگین(گۆڤار)، ژ٥٢، سالی ١٩٩٣،(چمکێك لەژیانی جافەرسانی هەورامان).

٨)مەحمود مەلا عیزەت، کوردستانی نوێ(رۆژنامە)، ژ٥٩٢،رۆژی ١٩٩٤/١/٢٠

(لێرەدا پێویستە ئەوراستییە پێشچاوبخەین کەحەمەرەشید خانی بانە ماوەیەکی دوورودرێژ لەخەباتی خوێناوی‌دا بووە دژی فەرمان رەوایانی ئێرانو چەندین جار بەرووی سوپای ئێراندا هەلپژاوە، لەسەردەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا لەلێپرسراوە سەربازییە بەدەسەلاتەکانی کۆمارەکە بووە، پلەی ژەنەراڵیپێدراوەو ناوچەیەکی گرنگو هێزیکی ریکخراوو بەئومێدی سەرکردە دەکرد. چەندین نامەی سەربازیو سیاسیو کاروباری ئیداری پارێزراوەکە لەو سەردەمەدا ناردوویەتی بۆ فەرماندەکانی کۆمار، یان لەفەرماندەکانەوە بۆ حەمە رەشیدخان نێرراوە، بەراستی کاك مەحموودی مەلا عیزەت کاریکی دڵسۆزانەی بەئەنجام گەیاند کەدوای ماندووبوونێکی زۆر ئەونامەو دۆکۆمینتانەی کۆکردەوەو لەکتێبێکی تایبەتی‌دا بەچاپی گەیاندن، بۆئەمەیش بروانە:

مەلا مەحمود عیزەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، بەرگی یەکەم، سوید، ١٩٩٢.

(١٠،٩)کوردستانی نوێ(رۆژنامە)هەمان ژمارەی پیشوو.

11)Gavan S.S Kurdistsan divived Nation Of The Middle East, London, 1958, P33

١٢)حوكمی قاجاری لەسالی ١٧٩٤ی زایینی بەئاغا محەمەد خانی قاجار دەستی پێکردووە، ساڵی١٩٢٥بەهێنانە خوارەوەی شا ئەحمەد کۆتایی بەبنەماڵەی قاجارییەکان هاتو بنەماڵەی بەهلەوی شوێنی گرت.

١٣)رەزاخان سالی ١٩٢١بەپلەی عەقید تولنی ببێتە سەرەك وەزیرانی ئێران، دوای چوار ساڵ واتا سالی ١٩٢٥شا ئەحمەد میرزای لەسەر کورسی پاشایەتی داگرتو بووبەئیمپراتۆری ئێران، سالی ١٩٤١لەگەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا هەلاتو بەشکستی لەئێران شاربەدەرکرا.

١٤)حەمە رەزا شا سالی ١٩٤١لەشوێنی رەزاخانی باوکی دانیشت، سەعات دەوچارەکی رۆژی شەممەی ١٩٧٩/١/١٦بەچاوی فرمێسکاویو دلێشکستەوە ئێرانی بەجێهێشتو بەرەو میسر کەوتە ری، رۆژی ١٩٨٠/٧/٢٧لەمیسرکۆچی دوایی کردو دوای ئەوەی کەماوەی ٣٨ساڵ گەلانی ئێرانی چەوساندەوە.

١٥)ئەحمەد خواجا، چیم دی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٧٠، ل٨٥.

***

بەشی دووەم

# بەرکولێ لەژیانی مەحموود خانی دزلی

مەحموود خانی دزلی کوری (عەزیزخان)ی کوری (بارام بەگ)ە و دایکی ناوی (پیرۆزە)یەو کنچی (حەسەن سولتان)[1]ی گەورەی هەورامان بووە، دایکی بە بنەماڵە دەچێتەوە سەر شێخانی عەبابەیلی..

مەحموود خان سالی ١٨٧٠ی زایینی[2] لە ئاوایی (دزلی)[3] ناوچەی (هەورامانی تەخت)[4] لەدایك بووە، دوای ئەوەی (عەزیزخان)ی باوکی کە یەکێك بووە لە سەردارە دەست رۆیشتووەکانی هەورامان کۆچی دوایی دەکات، مەحموود خانی کوری دەبێتە جێنشینو لەئەنجامی توانستو لێهاتوویی‌دا دەسەلاتی فراوانی بەسەر ناوچەی دزلی‌و دەوروبەری هەوراماندا بلاو دەکاتەوەو بەچەشتی گەورە پیاوێکی ئەو سەردەمەی کوردو سەرۆك عەشیرەتێکی بەدەسەلاتی رۆژهەلاتی کوردستان دەناسرێ.

خانی دزلّی لەژیانیدا چەند هاوسەرێکی خواستووە کە دواترینیان (نازیف خـان)[٥]ی (مـەحمود خـدر)ی سـەرداری هەمـەوەند بـووەو لەسـەرجەم هاوسەرەکانی یانزە کورو شەش کچی بووەو زوربەیان کۆچی دوایی کردووەو هەندێکیشیان ماون[٦].

ئەم سەردارە لەئەنجامی تێکۆشانو گیانی بەرهەڵستکاری‌دا چەندین جارو لەسالانی جیاوازدا دەربەدەر کراوەو خراوەتە گرتوخانەکانی (هندستان، سنە، قەسری قاجار، هنێدی، رومادی، سلێمانی، کەرکووك، بەغداد)و زۆر جاریش بەدەست بەسەری رەهەندەی شارەکانی ئێرانو عیراق کراوە.

دکتۆر موکەرەم تالەبانی لەنووسینو بیرەوەرییەکی زیرەکانەدا بەناونیشانی (مەحموود خانی دزلّی -م چۆن ناسی)[٧] بەکورتی لەو رۆژانە دەدوێ کە خانی دزلّی لەکەرکووك بەندکراوەو دەڵێ (چوار دیواری بەندیخانە وای لەمەحموود خان کردبـوو کـە رۆژتـا ئێـوارە چـاو ببرێتـە دەرگـا ئاسـنەکەی بـەڵکو یـەکێك دەنگوباسی ماڵو منالەکانی بۆ بهێنێت، بەلام ئێوارە بەبێ هیوایی دەگەڕایەوە سەر نوێنـە شـڕەکانیو سـەری دەنایـەوە، بەڕاسـتی نـائومێدیو بـێ کەسـیو دەست کورتی وادەکات کە رۆژێکی بەندیخانە بەساڵێك بڕوات، بەلام دەبێ وەك هـەموو بەندیـەك رۆژی خـەتێك لـەدیوارە رەشـەکە بکێشـێت تـا دەگاتـە دوو هەزارو هەشت سەدو هەشتا، ئێوارە کەیلەکەی هەڵدەگرتو بۆ کەوچکە شۆربا نا پوختەکەی بەندیخانـە ریـزی دەگـرتو تفێکـی وەکـوو تفەکـەی -کیسـرای مـەدائن-ی لـە بـەختی خـۆی دەکـردو شـۆرباکەی هـەڵدەقوڕان: هەشـت سـاڵ کۆتایی هات بەلام ستەمکاری دەرهەق بەخانی دزلّی هێشتا کۆتـایی نـەهاتبوو، هـەورامان لـەخان قەدەغەیـە، رۆژی بـەربوون کـە لـە دەرگـای بەندیخانـە سـەری دەرهێنا چاوی بەقەلای کەرکووك کەوتو وەك فیلمێکی سینەمایی ئەو رۆژەی هاتـە پێشـچاو کـە لەکـەڵ گۆیـژە سـەری دەرهێنـاو نواریـە شـاری سـلێمانی

داگیرکراوو بەسەدان سیلاح شۆڕی پەستەك لەبەر چاوەڕوانی فەرمانی خانیاز نەکردو بەسەدان ئەسپ سمکۆلانیان بوو بۆ هێرش بردنو رزگارکردنی شاری دڵگیری سلێمانی، هۆشیکی هاتەوەو تاس بردی‌یەوە کە ئێرە گۆیژە نی‌یەو تەنیا حەمە سەعید چاوەڕوانی دەکات، دەبێ دەست بەسەربێ، بەلام کۆ دالدەی خانێکی لێقەوماو دەدات، بڕیاری‌دا روو بکاتە تەکیەی تالە بانی، ئەگەر وەك خانێکیش دالدەی نەدات خۆ وەکوو دەروێشێك جێی دەکەنەوە، بەلام مەحموود خان وەکوو خانی دزلی پیشوازی لێکرا نەك لەتەکیەو خانەقا بەلکو لەهەموو مالێکو لەدلی هەموو ئینسانێکی بەویژدان جێگای خانی دزلی دەبێتەوە)[٨] هەروەها دکتۆر لەو یادداشتنامەیەدا درێژە بە باسەکەی دەداتو وەسفی خانی دزلی بەم شێوەیە دەکات (مەحموود خان پیاوێکی بالابەرزی چوارشانەی رووپانی سوورو سپی بوو، جووتە سمێلێکی درێژو رێك بەلام ماندوویەتی -ئیچ قەلا- و هەشت سالی بەندیخانەی کەرکووكو بێکەسی‌و دەستکورتی هەندێك شێوەی گۆڕی بوو، سمێلەکانی بۆزو قورسی باری ژیانیش هەندێ پشتی کۆم کردبوو، پیاوێکی کەم دوو، مەندو بەویقار، ئاهە درێژەکانی لەئاوو دوکەلی ئێرگەلەکەی‌دا ون دەکرد بۆئەوەی کەس هەست بەسۆزی نەکات)[٩].

خانی دزلی پیاوێکی دلتەڕو قسە خۆشو بێ فیزو تا بلێی نان بدەو بەخشندە بووەو لەسەردەمی دەسەلاتی‌دا دزلی‌و ئاوایی‌یەکانی دەوروبەری بوو بوونە پەناودالدەی ئەو کەسانەی کە لەدەست رژێمە داگیرکارەکان هەلاتوونو لەو مەلبەندەدا حەساونەتەوەو لە بەشێکی تایبەتی ئەم کتێبەدا فراوانتر دێینەوەسەری.

خانی دزلی چەندین جار بەخۆی‌و بنەمالەو جەنگاوەرەکانی‌یەوە بەرەو رووی رژێمی قاجاری‌و رەزا شاو حەمەی کوڕی بووەتەوەو لەباشووری

کوردستانیشدا شکستی بەدارودەستەی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی هێناوەو بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاو وەزارەتی موستەعمەرات سەلمێنەری ئەم وتەیەن.

خانی دزڵی پەیوەندی‌یەکی بەتینو دانەبراوو برایانەی لەگەڵ (شێخ مەحموودی حەفیدزادەی بەرزنجی)دا هەبووەو تەنانەت نووسەرو مێژوو نووسی ئەمر (رەفیق حیلمی) لەیادداشتەکانی‌دا (خانی دزڵی بەپاڵەوانی شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحموود داناوە)[10] و لەدوای جەنگی دەربەندی بازیانو لەسەرداواکاری ئینگلیزەکان خانی دزڵی گیراو نێرراوە بۆ تارانو بەغداو لەوێوە بۆ هیندستان.

لەمانگی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٢٢داو بەبۆنەی گەرانەوەی شێخی بەردەقارەمانەوە لەدەست بەسەری بەخۆیو هەندێ لە کورو ئامۆزاوکەسانی بنەماڵەکەی زیارەتی شێخ مەحموودیان کردووەو رۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی ئەو سەردەمە بەشانازیو وەفاوە ئەم هەواڵەیان بلاوکردووەتەوە[11].

ئەحمەد خواجا لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ (عەبدولرەقیب یوسف)دا سازی کردبوو دەلێت (مەحمود خان بۆ راپەراندنی کاروباری تایبەتیو جەنگی ئەنجوومەنیکی لەکوێخاو دەم راستی گوندەکانی ژێر دەسەلاتی پێکهێنابوو، هەموو کاتێکیش لەلای ئامادەبوونو بریتی بوون لە حەوت کەسو سەرۆکەکەیان ناوی -کوێخا زۆراب- بوو، خانی دزڵی راوێژی پێ دەکردنو گەر کارێکی نائاسایی رووی بدایە جیی متمانەو پرسو راوێژبوونو بە زوویی فرمانەکانی خانی دزڵی‌یان بە ئەنجام دەگەیاند)[12].

خانی دزڵی بەپێی سیاسەتو بارودۆخی ئەو رۆژگارەو بەمەبەستی بەرهەڵست کردنی ئینگلیزەکان پەیوەندی لەگەڵ کەمالی‌یەکاندا بەستووەو

نامەی تایبەتی بۆ مستەفاکەماڵ ناردووە بەڵام دواتر کە لە مەبەستیان گەیشتووە لێیان کشاوەتەوەو لەبەشێکی تایبەتی ئەم کتێبەدا زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە دواوین.

خانی دزڵی دۆستی خۆشەویستی (سمکۆی شوکاك)و (سەردار رەشیدی ئەردەڵان)و (حەمە رەشی خانی بانە) بووەو لەباشوری کوردستاندا کەسانی وەك (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند)و (سەید محەمەدی جەباری)و (شێخانی تالەبان)[13] و (کەسنەزان)[14] لەگەڵ خانی دزڵیدا پەیوەندییان بەتین بووە. بەڵام لەرووی ئاینیەوە پەیوەست بووە بە (شێخ نەجمەدینی بیارە، ١٨٦٢، ١٩١٨)[15] و تەنانەت دوو خوشکی خانی دزڵی بەرودوا خێزانی شێخی ناوبراو بوون.

بەپێی پرسو گەڕانو سۆراخی بەردەوامان گەیشتینە ئەو راستییەی کە خانی دزڵی لەسەر داوای دەستەیەك لە نیشتمان پەروەرو روناکبیرانی کورد بووە بە ئەندامی پارتی هیوا[16].

لەساڵی ١٩٤٠ لەکاتێکدا خواڵێ خۆشبوو (مستەفا بارزانی) بەدەست بەسەری بۆ شاری سلێمانی دوور دەخرێتەوە، لەهەمان کاتدا (مەحموود خانی دزڵی)ش لەسلێمانی دەست بەسەر دەبێ‌و هەردوکیان ماوەیەك لەسلێمانی دەمێننەوە، رۆژی ١٢ی تەمموزی ١٩٤٣ مستەفا بارزانی هەڵ بۆ دەرەخسێ‌و بەیارمەتی خواڵێخۆشبوو (شێخ لەتیفی حەفیدزادە-١٩١٧-١٢/٥/١٩٧٢) خۆی دەرباز دەکاتو بەرێگای (پێنجوین، بانە، سەردەشت، پەسوێ، لاجان، ناودەشت، سیلکە، سرێشمە)دلو بەماوەی هەفتەیەك دەگاتەوە لانەی باوو باپیرانی، پاش سێ رۆژ واتا لەرۆژی ١٥ی تەمووزی ١٩٤٣دا خواڵێخۆشبوو شێخ بابە عەلی شێخ مەحمودی حەفیدزادە رێگای دەرچوون بۆ خانی دزڵی ئاسان دەکاتو بەهۆی دڵسۆزەکانییەوە لەرێگەی شارەزوورو سوورێنەوە

دەگاتەوە ئاوایی دزلّی و بەمەلّبەندی لەدایك بوونو ژیانی شاد دەبێتەوەو سەرلەنوێ پشکۆی راپەرینو تێکۆشان دەگەشێنێتەوە.

لەسەرەتای سالی ١٩٤٦دا خانی دزلّی روودەکاتە گوندی (هانەی قول)[17] و لە ئەشکەوتی (وشکەناو) کە بە ئەشکەوتی (مەحموودخان)یش ناسراوە دەمێنێتەوە، پاش ماوەیەك حکومەتی (حەمە رەزا شا)ی ئێران داوای دانیشتنو وتو وێژی لیّ دەکاتو بەومەبەستەی کە بگەنە ئەنجامێكو گیرگرفتی ناوچەکە بەشێوەیەکی ئاشتی‌یانەو بێ‌شەرو شۆر ببڕیننەوە، (خانی دزلّی)ش بەپیر ئەم داوایە دەچێتو بەلاّم بەفێلّو تەلەکەبازی کە هەمیشە بەرنامەی کارو هەلسووڕانی فەرمان رەوایانی ئێران بووەو لەبەهاری سالی ١٩٤٦دا بەدەستی ئەفسەرێکی ئێرانی لەگەل (ملە خۆرد)[18] کە دەکەوێتە سنووری ئیرانو عیراقەوە دەرمان خواردەکرێو دوای نۆ رۆژ بەو رووداوە پر لەناسۆرە کۆچی دوایی دەکات[19].

بەم شیوە مەرگەساتە لاپەڕەی ژیانی پرلەدلّسۆزیو مەردایەتی پێچرایەوەو لەکاتی کۆچ کردنی‌دا فەرمان رەوایانی ئێران داوای تەرمەکەیان کردەوە، بەلاّم شێخ مەحمودی حەفیدزادە کاربەدەستانی (خورمال)ی ئاگادارکردەوە کە وەلاّمی ئەم داوایە نەدەنەوەو دوایی بەجۆرێکی شایستەو قەدرزانین لەگوندی (هانەی قوول) بەخاکی ئازیزی کوردستان دەسپێردرێو سەری هەمیشەیی دەنێتەوە دوای ئەوەی کەنیوسەدە کاراترین دەوری شۆڕشگێڕی لەسەرشانۆی سیاسەتو کوردایەتی بینی.

### ئاوایی‌یەکانی مەحموود خانی دزلی

مەحموود خانی دزلّی وەك سەرەك عەشیرەتێکی بەدەسەلاّتو گەورە پیاوێکی ناوچەکە جگە لە (دزلّی) کە مەلّبەندی لەدایك بوونو ژیانو خەباتو

جێی دانیشتنی بووە، هەندێ گوندو ئاوایی تریشی هەبووەو لەژێر سایەو فەرماندەیی خۆیدا بوون وەك:

١-نژمار: نزیك (كانی دینار)ەو ماوەی پێنج كیلۆمەتر لە (مەریوان)ەوە دوورە.

٢-دەری: دەكەوێتە ناوچەی (مەریوان)و نزیك (پردی گاران)ە.

٣-شارانی: نزیك گوندی (نژمار)ە.

٤-مرگ: لەنێوان (شارانی)و (نژمار)دایە.

٥-زەلكە: بەرانبەر بە (دەربەند دزلێ)یە[٢٥].

٦-دەرەناخی: هاوشانی (زەلكە)یەو بەرانبەر (دەربەند دزلێ)یە.

## هاوینەهەوارەكانی دەوروبەری دزلێ

١-هانەسابە: دوای ئەوەی كە بۆ جاری دووەم لەشەوی ٣١٢ی مانگی مارتی ساڵی ١٩٢٣دا بەفەرمانی شێخ مەحموود سلێمانی چۆڵكرا، زوربەی خێزانو كەسو كاری شێخی ئەمر روویان كردە دزلێو ماوەیەك لەم هاوینەهەوارەدا مانەوە.

٢-سیاكۆڵە: هاوینە هەواری تایبەتی شێخی ئەمر بووەو ئێستاش شوێنی كەپرەكانی ماوە[٢١].

٣-ماوەزە: هاوینەهەواری تایبەتی مەحموودخانی دزلێ بووە.

٤-مەیدان
٥-سەردانی

ئەم دوو هاوینەهەوارەیش دەكەونە ناوچەی دزلێیەوە.

بارام بەگی دزڵی
حبیب اللە بەگ
جان اللە بەگ
عەزیزخان
قادر بەگ
محەمەد عەلی بەگ
محەمەد ئەمین بەگ
عەلی محەمەد خان
محەمەد رەشید بەگ
محەمەد ساڵح بەگ
مەحموود خانی دزڵی
عەبدوڵلا خان
حەمە ئەمین بەگ
عەبدولکەریم
عەزیز
خەلیل
محەمەد
ئەنوەر
منصور
رەفعەت
سەردار
مەجید
بورهان
جەمال
جەمیل
کاوە
ئەدهەم
مادح
عیزەت
حەمە
ئەمیر
ئەحمەد
کەمال
خسرو
فیصل
لوقمان
ئەرکان
عەرەسو
منصور
رێبوار
بەختیار
کاوە
ئاری
ئاریز
رەنج
رۆژ
کۆسالان
میرخان
ئاریان
کاوان

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی دووەم:

(١)لەهەوراماندا دووکەس بەنازناوی (سوڵتان)ەوە بەگەورە ناسراون، یەکەمیان (حەسەن سوڵتانی کوڕی حەمە سولتان)ە کە بەسەرشامیاندا حوکمران بوو، ئەم حەسەن سوڵتانە باوکی دایکی مەحموودخانی دزڵی‌یە، لەرۆژی (٥) ذی العقدەی ساڵی ١٢٨٤دا لەلایەن (معتمد الدولە) وە کوژراوە چونکە کرنووشی بۆ نەبردووە، دواتر کوڕەکانی چەند جارێك بەرانبەر بە (معتمد الدولە) وەستاون. دووەمیان حەمەسەعید سولتانی کوڕی عوسمان سولتانی فەرمان ڕەوای هەورامانی لهۆن بوو، حەمە سەعید سوڵتان باوکی جافەرسانی هەورامانە.

لەلایەکی ترەوە خەلکی هەورامان بنەچەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر (بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیار)و دەڵێن (لەسەردەمی دەسەلاتی ئەسکەندەری کوڕی فەیلەقوس بەسەر ئێراندا ئەوەندەی لەتوانایدا هەبوو شازادەو داروەستەی سەربە پاشاکانی کەیانی زەلیلو زەبوون کردوو هیندێکی لەو چیایە بەند دەکردن بۆیە ئەم کێوە بەزیندانی ئەسکەندەر بەناوبانگە).

بۆ ئەم زانیاریانە بڕوانە (عبدالقادر کوڕی ڕوستەمی بابان، ڕەوشی کوردان، وەرگێرانی لە فارسی‌یەوە کەریمی حیسامی، ناوەندی چاپو ڕلزاندنەوەی مەنسور، ١٩٩١، ل٧٨.

(٢)ئەم مێژووی لەدایك بوونە بۆ یەکەم جار لەلایەن نووسەری ئەم کتێبەوە ساڵی ١٩٧٢ تۆمارکراوەو لەدوای ئەو باسە مێژوویی‌یە هەرکەسێ لەباسەکانیدا تۆماری کردبێ لەوسەرچاوەیەی وەرگرتووە، دکتۆر فوئاد حەمە خورشید وەك زاناو پسپۆڕێك لەکتێبە وەرگێڕاوەکەیدا پەنجەی بۆ ئەم باسەی نووسەر ڕاکێشاوە، (العشائر الکردیە) ترجمە وتعلیق فؤاد حمە خورشید، بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٧٩، ص١٦) بەڵام بەداخەوە نووسەرێکی دوور وڵات ئەم مێژووەی لەکتێبە گەورەکەیدا تۆمار کردووەو بەبێ ناوبردنی سەرچاوەکەی بۆ باسەکەی نووسەری ئەم کتێبە کە یەکەم سەرچاوەیە بڕوانە: عومەر مەعروف بەرزنجی، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژ٤ ص٢، حوزەیرانی ١٩٧٢ (بابەتی مەحموودخانی دزڵی‌و لاپەڕەیەك لەمێژووی کورد).

(٣)ئاوایی دزڵی دەکەوێتە نێوان سنووری ئێرانو عێراقەوەو لەسەرچاوەی زەلمەوە ماوەی دوو سەعات دوورەو نزیك گوندی هانەی قوڕلە.

(٤)دانیشتوانی هەورامان بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بەدوو بەشەوە، یەکەمیان (هەورامانی تەخت) کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕیزە چیای هەورامانو ئێستا سەر بە ئێرانەو بەشێکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. دووەمیان (هەورامانی لهۆن) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای زنجیرەچیایی هەورامانو ئێستا سەر بەعێراقەو بەشێکە لەباشووری کوردستان.

(٥)خانی دزلّی لەژیانیدا چەند هاوسەرێکی خواستووە (خاتوو زیبا، خاتوو فاتمە، خاتوو مریەم، خاتوو زینەت، خاتوو فەرەنگیز ) نازیف خان) ئەمەی دوایی یان واتا (نازیف خان) لەپێشدا خێزانی پالەوانی شۆڕشی شێخ مەحموود خوالێخۆشبوو (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) بووەو دوای شەهیدکردنی کەریم بەگ خانی دزلّی خواستوویەتی‌و دوو کوڕو کچێکی لێ بووە، کوڕەکان ئەنوەر بەگو مەجید بەگ لەگەڵ نەجیبە خانم کە خێزانی خوالێخۆشبوو (شێخ ئەمینی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی) بووە وە ئێستا لەژیاندایە.

(٦)خانی دزلی لەسەرجەم هاوسەرەکانی ئەم کوڕانەی هەبووە:

عەبدوللا خان، حەمە ئەمین بەگ، عەبدولکەریم، عەزیز، خەلیل، محەمەد، ئەنوەر، مەنصور، رەفعەت، سەردار، مەجید.

ئەمانیش ناوی کچەکانێتی:

عەینە، سوڵتانێ، ئامین، عاصم، حنیفە، نەجیبە

(٧،٨،٩)دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، گۆڤاری رەنگین، ژ ٥٣ سالی ١٩٩٣.

(١٠)رەفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، بەغداد، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٦.

(١١)رۆژی کوردستان، ژ ١١، س١، هەینی، ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ بەناونیشانی (جەنابی مەحموود خانی دزلی) بلاوکراوە تەوەو ئێمەش وەك بەڵگەیەکی مێژوویی لەبەشی بەڵگەنامەکاندا وینەی ئەو ژمارەیەمان بلاوکردووەتەوە.

(١٢)مامۆستای خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجا لەمێوارەی ١٩٩٤/٧/٦داو کە تەمەنی ئەوکاتەی ٩١ سال بوو لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ مامۆستا (عەبدولرەقیب یوسف)دا ئەم باسانەی وتووەو مامۆستا (عەبدولرەقیب) بەمەبەستی هاوکاری دەقی چاوپێکەوتنەکەی بەدەستخەتی خۆی پێشکەش کردبێ.

(١٣)پەیوەندی نێوان سەرۆکو سانەکانی هەورامانی ئەم دیوو ئەو دیو لەگەڵ شێخانی تاڵەبانو تەکیە بەناوبانگەکەی لەگەرێتەوە بۆ سەردەمیکی دێرین، بەلام لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ئەم پەیوەندییە زیاتر پەرەی سەندووەو تەنانەت جافەرسانی لەهۆنو مەحموود خانی دزلی لەزۆر بۆنەی خۆشی‌و ناخۆشیدا ڕوییان کەوتووەتە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووکو یەکێك لەوانەی کە بەتەواوی لەگەڵیاندا تێکەڵ بووە بنەماڵەی خوالێخۆشبوو (شێخ جەمالی تاڵەبانی) بووە. دکتۆر موکەرەم تالەبانی لەم سالانەی دواییەدا چمکێکی مێژووی ئەم تیکەلاوییەی بلاوکردەوە.

(١٤)شیخانی کە سنەزان وەك شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمو شێخ حسێنی کوری شێخ رەزای شێخ فەتاحی کرپچنەو زۆری تریش لەدەوروبەری جەنگی مێژوویی (دەربەندی

بازیان)دا پەیوەندی‌یان بەتین بووەو تەنانەت لەدوای ئەم جەنگە روویان کردووەتە ناوچەکانی مەریوان‌و دزلی‌و لەم شوێنانەدا حەساونەتەوە.

(١٥)شێخ نەجمەدین برای شیخ عەلائەدینی نەقشبەندی‌یەو پەیوەندی‌یەکی رۆحی لەگەڵ خانی دزلی‌دا بووەو دەماودەم دەی گێڕنەوە.

(١٦)پەیوەندی کردنی خانی دزلی بەپارتی (هیوا) وەو بوون بە ئەندامی ئەو پارتە سیاسی‌یە لەکاتی خۆیدا لەروناکبیری گەورە خوالێخۆشبوو (عەبدوللا جەوهەر ١٩٢٠-١٩٨٢/٦/١)م بیستووە لەم دواییەشدا شریتێکم کەوتە دەست کە لە رۆژی ١٩٨٤/٦/٢٦دا عەبدولرەقیب یوسف گفتوگۆیەکی لەگەڵ شێخ ئەمینی نەقشبەندی‌دا سازکردووەو بۆ ماوەی سەعاتێك شێخ ئەمین سەبارەت بە هەندێ لایەنی خانی دزلی دواوەو باسی مەسەلەی ئەندامێتی پارتی هیوای کردووەو دەڵێ کە لەزمانی (مەحمود خەفاف)ی بیستووە.

(١٧)هانەی قوول دەکەوێتە پشت خورماڵەوەو هاوشانی (یاڵان پێ)و (زەڵم)ە.

(١٨)شێخ لەتیف شێخ مەحموود لە شیعرێکی‌دا بەبۆنەی کۆچی دوایی سەرداری کورد شێخ مەحمودی نەمرەوە ناوی کەل (ملە خۆرد)ی هێناوە:

سورکیو، ملەخۆرد، هەتا زمناکۆ

تا رۆژی مەحشەر بکەن باوکەڕۆ

(١٩)لەوکاتەدا لەخورماڵ کەسی لی نابێ یان زاتی ئەوەیان نەبووە کە بچن بەهانایەوەو هیچ پزیشکێکی فریاناکەوێت، بەڵام (کەریمەفەندی) ناوێك کە برین پێچێکی خورماڵ دەبێ دەگاتە لای‌و تێ‌دەگا کە ژەهری دراوەتێ‌و چەند دەرزی‌یەکی لی دەداتو بەڵام چاری نابێ‌و دوای نۆ رۆژ کۆچی دوایی دەکات.

(٢٠)شێخ لەتیف حەفید لەشیعرێکی‌دا ناوی دەربەند دزلی هێناوە:

جـــا فرمیسك بۆکن بچن بەهاوار

مەحموود خان دەعوەت بکات لەبەهار

ئـــەی دەربەند دزلی‌و سیاکۆو دزلی

کـــێ تیا هەلسووری بکا سەرچلی

(٢١)لەو سیاکۆلەیەدا بووە کە (شێخ سەلام١٨٩٢-١٩٥٩/٢/٣)ی شاعیر لەلایەن شێخی نەمرەوە هەشت مانگ بەندکراوەو دوایی کە شێخ هاتووەتەوە سلێمانی بەرەڵڵای کردووە، بۆ ئەمەش بڕوانە:

دیوانی سەلام، چاپخانەی تەمەدون، بەغداد، ١٩٥٨، ل١٤، چاپی یەکەم بەپێشەکی دکتۆر مارف خەزنەداروبە سەرپەرشتی نووسەرو رۆژنامەنووسی چالاك جەمال خەزنەدار.

## بەشی سێیەم

# بزوتنەوەکانی خانی دزلی لە رۆژهەلاتی کوردستان

بنەماڵەی(بارام بەگ) ی دزلی سەر بە هەورامانی تەخت وەك بنەماڵەیەکی دەست رۆیشتووی خاوەن سامانو دەسەلاتو زەوىو زار، لە هەمان کاتدا شۆرشگێرو بە تواناو جەنگاوەرو نموونەی بەرهەلستکاری بوون. (بارام بەگ) لە رۆژگاری زەبروزەنگی (قاجار) ی یەکاندا چەند جارێك لەگەڵ دەسەلاتدارانی ئێراندا بە یەکدا هەلپژاونو سوپای داگیرکاری ئێرانیان لە پەلوپۆ خستووە، تەنانەت (ناسرەدین شای قاجار ١٨٤٨- ١٨٩٨) (١) بەم جموجولانەی (بارام بەگ) و تیرەو بنەماڵەکەی شپرزە بووەو ماوەیەکی زۆر خۆىو سوپاکەی بە دامرکاندنەوەی ئەو بزوتنەوانەوە خەریك کردووە. ئەم هەلوێستو بەرەنگارىیە لە سەردەمی (عەزیز خان) ی کورىدا بەردەوام بووە، بەلام لە کاتێکدا کە (مەحمود خان) ی کوری (عەزیزخان) ی دزلی جلەوی فەرمان رەوایی ودەسەلاتی تیرەو بنەماڵەکەی دەگرێتە دەستو بە دووچاوی سەرنج لە ستەمی قاجارىیەکانو دواتر زەبروزەنگی (رەزا شا) و(حەمە) ی کوری ورد دەبێتەوە، ئەم هەستە شۆرشگێرانەیە دەچێتە مەودایەکی فراوانتر و بە پێی بەرنامەو

بۆچوونی لە بارتر مامەڵە لەگەڵ رژێمە داگیرکارەکانی ئێراندا دەکاتو وەك هێزێکی بە تواناو بەرهەڵستکار دەوری نیشتمانیو نەتەوایەتی لە ناوچەکەدا دەبینێ.

گەر لە مێژووی ژیانو رۆژگاری خانی دزلّی ورد بینەوە و چاوێکیش بە هەندێ سەرچاوەی مێژوویی‌دا بگێڕینو سۆراخی ئەو بارودۆخە جەنجاڵەی رۆژهەلاتی کوردستان بکەین دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە داگیرکارانی ئێران بە هەموو جۆری پلانی توانەوەو سەرکوتکردنیان داناوەو لە بەرانبەریشدا شۆڕشگێڕانی کورد بەرەو روویان وەستاون، یەکێکی وەکوو خانی دزلّی لە سەرەتای وەرگرتنی دەسەلاتی تیرەکەیەوە هەردەم دژی سیاسەتی چەوساندنەوەو ملهوری پاشایانی ئێران بووە. چەندین جار (قاجار) ی‌یەکانو رەزا شا لەشکریان سازداوەو ویستوویانە کە تواناو هێزو برستی ئەم سەردارە نەهێڵنو لەلانەی باووباپیرانی دەریان پەڕێنن، بەلام زۆر جار شکستی و هەناوکەوتن بەشی ئەم سوپایانە بووەو نەیان توانیوە بگەنە مەبەستو مەرامی خۆیان، هەرچەندە بەو هێرش و پەلامارو لەشکرسازدانە هیمنی‌یان لە ناوچەکەدا بڕیوەو زیانیان بە زۆربەی دانیشتوانی ئاوایی‌یەکان گەیاندووە.

ئێمە لەم کتیبەدا بە نیازین کە بە پێی توانستو مەودای دەستکەوتنی زانیاری پێویستو بەڵگەی مێژوویی چەپکێ تیشکو رۆشنایی بخەینە سەر هەندێ لەو بزوتنەوەو جموجوڵانەی کە خانی دزلّی فەرماندەیی کردووەو لەگەڵ سوپاو لەشکری داگیرکارو خۆفرۆشاندا کەوتووەتە جەنگەوە. بەلام ئامانەوی ئەو لافە لێبدەین کە توانیومانە لە هەموو بزوتنەوەو هەڵسوڕانەکانی بدوێین، چونکە نەبوونی سەرچاوەی نووسراوو بەڵگەنامەی دروست ئەم ئامانجە پیرۆزەی بەدی نەهێناوینو هەندێ رووداوو بزوتنەوەی هەروا بە داخراویو کلۆم کراوی ماونەتەوە، بەهەر حاڵ ئەوەی لە فەوتان قوتاریان

بووبی‌و دەست ئیمە کەوتبی لە سەر لاپەڕەکانی ئەم کتێبە تۆماریان دەکەین‌و وەك بابەتو کێشەیەکی مێژوویی قسەیان لەسەر دەکەین.

(ساڵی ١٩٢٦ لە زۆربەی ناوچە کوردی‌یەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان‌دا ڕاپەڕین‌و جووڵانەوەی چەکداری جۆشی سەند، تیرەکانی بانەو سەقزو سەردەشت‌و شوێنەکانی تر دەستیان دایە ڕاپەڕین وژمارەیەکی زۆر لە سەربازگەو بارگەو بنەی دەوڵەتیان سووتاند.

لە ناوچەکانی باشووریش تیرەکانی (هەورامان‌و مەریوان) بە سەرکردایەتی (مەحمود خانی دزلی) و (مەحمود خانی کانی سانان) و(جافەرسانی هەورامان) پەیامی ڕاپەڕینیان گەیاندو هەر لەو کاتەدا پەیوەندی‌یان بە (سالارالدولە) وە کردو بۆ ماوەیەکی زۆر ناوچەکانیان چەنجاڵ کردو لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتیان دەرهێناو لەم ماوەیەشدا شێخی بەردەقارەمان لە ناوچەی مەریوان بووە) (٢).

لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٠دا حکومەتی ڕەزا شا بەو مەبەستەی کە چەکی عەشایەرەکان کۆبکاتەوەو جموجوڵیان نەهێڵی‌و داوای لە سەرەك ئێڵ‌و تیرەکانی سەرجەم ڕۆژهەڵاتی کوردستان کرد کە لە ماوەیەکی دیاری‌کراودا چەك‌و پێویستی جەنگ تەسلیم بە حکومەت بکەن، بەڵام مەحمود خانی دزلی‌و جافەرسانی هەورامانی لهۆنی بەو داواکاری‌یە قایل نەبوون‌وبەرەو ڕووی وەستانەوە، بەم هۆیەوە (ڕەزا شا) گەورەترین هێزی کۆکردەوە لە سوپاو هەندێ لە عەشایەرو داروبەستەکانی‌و لەنیوەشەوداو بە شێوەیەکی کوت‌و پڕ پەلاماری دەوروبەری دزلی‌و دەربەندە بەناوبانگەکەیان داو پاش شەڕێکی قورسی نابەرانبەری لەچەك‌و ژمارەدا مەحمودخان ئاوایی دزلی‌و دەوروبەری چۆڵ‌کردو گەیشتە سنووری عیراق‌و لە ناوچەکانی هەورامانی لهۆن‌دا ماوەیەك مایەوە. ئەم هێرش‌و پەلامارەی (ڕەزا شا) هێند سامناك‌و فراوان بووە و بایەخیان پێداوە هاتوون لە سەر بەردی مەڕمەڕ لە هەیوانی مزگەوتی جامیعەی

**شاری سنه خۆسازدانو بەیاننامەو ئەنجامی ئەو شەڕەیان بەزمانی فارسی هەڵکەندووەو تائێستاش وەك خۆی ماوە.**

**ئێمەش لێرەدا دەقی ئەو نووسینە فارسی‌یە بە زمانی کوردی تۆماردەکەینو وێنە فارسی‌یەکەیشی لە پاشکۆی بەڵگەنامەدا وەك خۆی بڵاودەکەینەوە[٣]، نووسینە هەڵکەندراوە فارسی‌یەکە بەم جۆرەیە:**

(بە ناوی پیرۆزی بەندەی ئالی حەزرەت شاهەنشاهی پەهلەوی، موڵکو سەڵتەنەتی ئاوایی دزڵی کە لە ناو کۆمەڵە شاخێکی سەختدایەو ڕێی تێپەڕینی ئەو ئاوایی‌یەش کەوتووەتە نێوان دوو دەربەندی تەسڵو سەختو بەردەڵان کە پێی دەوترێت- دەربەندی کلوێو دەربەندی دزڵی- چوار تووڵە ڕێی سەختیشی هەیە کە ناسراون بە-مەلا خۆرو کەماجارو کاوێو پیرڕۆستەم- ئەم دێیە لەژێر تەسەروفو دەسەڵاتی مەحمودخانی کوری عەزیز بەگی هەورامی‌دا بوو کە لە تایەفەی بارام بەگی‌یە. ئەم شوێنە لە بەرسەختیو نارەحەتی ناوچەکەوە لە بڵاوبوونەوەو دەرکەوتنی ئەستێرەی درەخشانی پەهلەوی یاخی بووبوونو هەر بەم شێوەیە مابوونەوەو بەپێی فەرمانو خواستی پیرۆزی بەندەی گەورەو حەزرەتی پیرۆزی شەهریار کە گیانمان فیدای بێت تیپی سەربەخۆو تایبەتی کوردستان کە لە دوو کەتیبەی پیادەو سوارەی پاڵەوانو یەك وەحدەی تۆپخانەو یەك کەتیبەی پڕ چەکی شەستیر کە بەشێکیان وەك پاسەوانی سەربازی لە دەربەندەکەدا بوونو هێزەکانی تریش لەگەڵ عەشیرەتی مەریوانیو بەشێك لە عەشیرەتی هەورامی شەوی ٢٤ی دیاە هێرشیان کردە سەر ئاوایی دزڵیو لە ماوەی شەش سەعاتدا هەموو جێگا سەختو شوێنە بەرزەکان لە چنگ شەڕخوازو یاخی‌بووەکان دەرهێنراو نیوەرۆی ٢٤ سەرکەوتوانە چوونە ناو دزڵی، ئەو سەرەك عەشیرەتو کەسە ناودارانەی لەم شەڕەدا بەشداری‌یان کرد بریتی بوون لە: سەرهەنگ مەحموود خان ئەمین فەرماندەی تیپو هێزی موهاجیر، سولتان حسێن خانی فەرماندەی هێزی پیادە، سولتان حەبیب فەخرەدین خان نائیبی یەکەمی فەتح، خان کلانتری، نائیبی یەکەم کەریم ئاغا میهرداد،نائیبی دووەم سەید هاشم خانی شوجاعی، نائیبی دووەم عەلی خانی مشکین نام، نائیبی سێیەم ئەحمەد خان قائیمی،

عەشایەری سولتان مەحمود خانی کانیسانانی سەرۆك عەشیرەتو ئەمنیەی مەریوان، بیگ نائیبی حکومەتی مەریوان کەیخسرەو بەگو ئەحمەد بەگی بالك، نائیبی ئەوەل عەین خان کەریمی فەرماندەی هێز، نائیبی یەکەمی طبیب ضیاءالدین خان پریا، نائیبی دووەم حەسەن خانی یەزدان سەنا، نائیبی دووەم بەهادین خان طبرسی، نائیبی سێیەم سەید ئەحمەد خان زرین میهر، عەشایەری حاجی محەمەد، سالّح سولتان محەمەد خان کرنابادی، محەمەد عەلی بەگی تفلی، حەسەن بەگی رەزایی، محەمەد شەفیعی هەورامی، عەلی محەمەد بەگی بەهرام ئابادی، محەمەد بەگی رەزایی) (٤).

١٣٠٩ شەمسی کە دەکاتە ١٩٣٠ زایینی

**گەر لەم بەیاننامەی حکوومەتی(رەزا شا) ورد ببینەوەو چاوێك بەوهەموو سەرکردەو سەرەك عەشیرەتانەدا بگێڕین کەبۆئەم پەلاماردانە کۆکراونەتەوە نیشانەی بەهێزی ورەو توانـاو ئازایەتی مەحمود خانی دزڵیو عەشیرەتە چاونەترسەکەی دەگەیەنێ، لەلایەکی‌ترەوە لەناوەرۆکی بەیاننامەکەدا سیمای دەوریکی کۆنی کۆمەڵگای کوردەواری بەدی دەکەین کەبەدرێژایی مێژووی وەك سیبەری خۆی لێی جیانەبووەتەوە ئەویش بریتی‌یە لەکۆمەڵو بەشداری چەند عەشیرەتو کەسانی ناودارو سەنگینی ناوچەکەو شان بەشانی ئەرتەشی ئێرانی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە سازداوە، ئەوەتا کەسیکی وەك (مەحمود خانی کانی سانان) کەچەندین جار رووبەرووی رژێمی ئێرانی بووەتەوەو لەم رێگایەدا ناسۆرو سزاو ئاوارەیی بینیوەو یەکێك بووە لەمرۆڤە ژیرەکانی سەردەمی خۆیو پشتیوانو خۆشەویستی شێخی نەمربووە، تەنانەت پێش ئەم رووداوەو دواتریش لەگەڵ مەحمود خانی دزڵیدا بەرانبەر بەرژێمی ئێران وەستاون، کەچی دەردی کوشندەی تیرەگەرێتیو مەسەلەی دەسەڵاتو موڵكو زەوی زارو پاشکەوتویی باری سیاسیو کۆمەلایەتی وای کردووە کەبکەوێتە هەڵەیەکی**

مێژوویی‌یەوە، نەك هەرئەمەیش بەلکو یەکێکی وەکوو(حەمە عەلی بەگی تفلی کەبەشداری ئەم هێرشەی کردووە خزمی نزیکی مەحمود خانی دزلی بووە.

پێویستە لێرەدا ئەوەیش بۆ مێژوو تۆمار بکەین کەلەهەمان کاتدا(جافەرسانی هەورامانی لهۆن) بەخۆیو جەنگاوەرەکانی‌یەوە بەرەو رووی سوپای ئێران وەستاو پاش جەنگێکی سەخت لە(شمشێرە )لەگەڵ هێزی نیرراوی کرماشان کەبەسەرکردایەتی کۆلۆنیل(رەزم ئارا)بوو توانی کەزیانێکی زۆریان پێ‌بگەیەنێ، بەلام دواتر سنووری بڕیو رووی کردە هەورامانی عیراق. لەکاتێکدا مەحمود خانی دزلی گەیشتە ئاوایی‌یەکانی هەورامانی لهۆن‌و پاش ماوەیەك کەوتە دەست حکومەتی عیراق‌و هێنرایە شاری سلیمانی، دەست بەجێ (رەزا شا)داوای لەدەسەلاتدارانی عیراق کرد کەخانی دزلی تەسلیم بەئێران بکرێتەوە، بەلام حکومەتی عیراق بەوبیانووەی کەخانی دزلی لەعێراقیشدا تاوانبارەو تەسلیم بەئێران ناکرێتەوە تاحوکمی تەواوی خۆی وەرنەگرێ. لە عیراقدا چەند ساڵێکی بەبەندیو دەست بەسەری تێپەراندوو رەهەندەی شاران کرا، لەم کاتەدا خوالێخۆشبوو(شێخ عەلائەدینی بیارە)هەوڵێکی زۆری بۆداو (سەید مەزهەر)[*]ی نوینەری تایبەتی خۆی ناردە لای مەلیك فەیسەلی یەکەم بەومەبەستەی کەگیانی پارێزراو بێت و تەسلیم بەئێران نەکرێتەوە.

لەلایەکی ترەوە لەوکاتەدا کەخانی دزلی لەشاری سلێمانی بووە خوالێخۆشبوو (شیخ حسێنی شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان) [1] لەرۆژی ١٩٣١/٩/٢٠دا بەناوی(حەفیدی پیری کەسنەزان)ەوە نامەیەکی پرلەسۆزو وەفاو دڵسۆزانەی بۆ موتەصەریفی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی دەنێرێو لەنامەکەدا بۆی روون دەکاتەوە کەمەحمود خانی دزلی یەکێکە

لەسەرداره ناودارەکانی ناوچەی هەورامانو شایانی قەدر زانینەو داوایش دەکات کەبەکەفالەت لەبەندیخانە بهێنرێتە دەرەوە[٧].

دیاره ئەم هەڵویستەی (شیخ حسێنی کەسنەزان) لەوڕۆژگاره جەنجاڵەدا نیشانەی جوامێریو بەتەنگەوه هاتنی دەگەیەنێ بەرانبەر بەمێژووی کوردو سەرداره دلێرەکانی.

خانی دزلی دوای زیندانیو دەربەدەری سالی ١٩٤٣دەگاتەوه ئاوایی دزلیو ئەمجارەیان لەگەڵ مەحمود خانی کانی ساناندا رێك دەکەونەوەو(سەرلەنوێ خانی دزلی بەهاوکاری خانی کانی سانان لەسالی ١٩٤٤دا هیرشیکی بەربلاو دەکەنە سەر هیزی دەولەت)[٨] بەلاّم پاش ماوەیەك مەحمود خانی کانی سانان نەخۆش دەکەویت، بەلاّم خانی دزلی وەك هێزێکی خاوەن ورەی بەرهەلستکار دەمێنیتەوه تائەوکاتەی کەبە فروفیلی کاربەدەستانی ئیران دەرمان خوارد دەکریو تۆماری ژیانی دەپیچریتەوەو دەچیتە لاپەرە نەمرەکانی میژووی کوردەوه.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی سێیەم:

١)سەبارەت بەشەرو شۆڕەکانی (بارام بەگ)ی باپیری مەحمود خانی دزڵی سەرچاوەیەکی نووسراوی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە، یان گەر بشبێت دەست نێمە نەکەوتووە، بەڵام ئەم کورتە زانیارییانەم لەخوالێخۆشبوو(شێخ ئەمینی شیخ عەلائەدینی بیارە) بیستووە کەلەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ (عەبدولرەقیب یوسف)دا سازی کردوەو رۆژی١٩٨٤/٦/٢٦لەسەر شریت تۆمارکراوە، شیخ ئەمین دەڵێ:(لەم ماوەیەدا کتێبێکی فارسیم دەستکەوت بەناونیشانی -رجال نال ایران- واتا پیاوە ناودارەکانی ئیران‌و باسی شەڕەکانی بارام بەگی دزڵی تیدایە بەتایبەت لەرۆژگاری- ناسرەدین شای قاجاردا. ئەوەی شایانی باسە(شیخ ئەمینی نەقشبەندی)زاوای مەحمود خانی دزڵی‌یە.

٢)حسن ارفع، کرد هاریك بررسی تاریخی‌و سیاسی، ل١٦(ئەم کتێبە لەبنەرەتدا بەزمانی ئینگلیزی دانراوەو دواتر وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

٣)دەقی ئەم بەیاننامە فارسی‌یە لەپاشکۆی بەڵگەنامەکاندا بڵاوکراوەتەوە.

٤)ئەم بەیاننامە فارسی‌یەم لە(کاوەی کوری نەنوەریەکی مەحمودخانی دزڵی) وەرگرت کەبۆ ئەم مەبەستە سەفەری شاری سنەی کرد.

٥)سەید مەزهەر لەئێراندا بەسەید مەزهەری عەلەوی‌و لەعیراقدا بەسەید مەزهەری حوسێنی ناسراوە، کوڕی سەید عەبدولکەریمی کوڕی حاجی سەید عەبدولسەمەدی کوڕی سەید عیسای سەربەتایەفەی (عەبدال سەمەدی)یەو لەتیرەی پیرخدری شاهۆیە، سالی١٣٢٠ی کۆچی لەدێی (چاوڕێلکان)ی نزیکی سنە لەدایك بووە، ماوەیەکی زۆر خەتیبی خانەقای بیارەو نووسەری تایبەتی شێخ عەلادین بووە، سەید مەزهەر لەشیعردا دەستی هەبووەو کۆمەلە شیعرێکی کوردی‌و فارسی هەیەو لەگۆڤاری(دەنگی گێتی تازە)دا چەند شیعرێکی بۆ بڵاوکراوەتەوە؛ سەید مەزهەر لەسەرەتای شیعرێکی‌دا دەڵێت:

دەنگی گێتی تازە دێت گوێ بگرە کورنە نۆرەتە

رەنــــگی تازەت وەرگرە ئەمرۆکە رۆژی فرسەتە

٦)شیخ حسێنی شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان، سالی ١٨٨٣ی زایینی لەدایك بووەو سالی ١٩٣٨کۆچی دوایی کردووە، شێخ حسێن براگەورەی شێخ عەبدولکەریمی کریچنەیەو یەکێك بوە لەناودارە ئایینی‌یەکانی شێخانی بەرزنجەو بەچەند

# بەشی چوارەم

## مەحمود خانی دزلی و شێخی نەمری بەردە قارەمان

## بەشی چوارەم

# مەحموود خانیدزڵیو شێخی نەمری بەردە قارەمان

دۆستایەتیو برایەتیو بڕوا بەیەك بوونو هاوکاری کردن لەنێوان (مەلیکی باشوری کوردستان شێخ مەحمودی حەفیدزادەی بەرزنجی)(١) و (میر مەحمودخانی دزڵی سەرداری هەورامانی تەخت) لە لاپەڕەکانی مێژووی دوورو نزیکی ئەم نەتەوەیەدا دیاردەیەکی دانسقەو تایبەتیو دووبارە نەکراوەیە، چونکە بەدەگمەن دۆستایەتییەکی درێژخایەنو هەتا سەر لەمێژووی ژیانی فەرماندەو سەرەك ئێلەکانی کوردو سەردارەکانیدا پلەیەکی بەرچاو روونی بڕیبێ. بەڵام لەیەکەم ڕاپەڕینی شێخی بەردەقارەمانەوە تائەو ڕۆژەی بەرچاوی تاریك کراو وازی لەسیاسەتو شۆڕش پێ هێنراو دوور خرایەوە بۆ باشوری عیراقو شۆڕشی کوردایەتی خەفەکرا مەحمود خانی دزڵی بەبێ لادانو پاشە کشەوپچڕان لەگەڵیدا بووەو تەماعو فروفێڵو پلانی داڕێژراوی داگیرکاران بەقەدەر تۆسقاڵێك لەکێوی ورەو دڵسۆزی نەڕوشاندووەو پشتی شێخی نەمری بەرنەداوە. ئەم راستییەش جگە لەوەی وەك چوری شیر ئاشکرانو ناشاردرێنەوە، لەبەیاننامەو دۆکومێنتەکانی ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاو وەزارەتی فرۆکەوانیو یادداشتی گەورە ئەفسەرو لێپرسراوانی

بەریتانیشدا باس کراون و ئارادەیەکی باش دانیان بەم یەکێتی و هاوکاری یەداناوەو خانی دزلێ یان بەدوژمنێکی سەرسەختی خۆیان زانیوەو بۆیان نەکەوتووەتەداوی هەڵخەڵەتاندن و دەست بەردار بوون لەکاری نیشتمانی و نەتەوایەتی و هەموو هەوڵ و تەقەلایەکیان لەم بوارەدا بەفیرۆ رۆیشتووەو بێ ئەنجام ماوەتەوە. چونکە لەو سەردەمەدا پوازو ئەلقە لەگوێکانی داگیرکاری کوردستان کەم نەبوون کەوەک درکێک چەقیبوونە ناوجەرگی شۆرشی کوردەوە، ئێمەیش لەم چەند لاپەرەیەداو بەپێی ماوەو توانست لەم بەشداری قوربانی دانە ئەدوێین بۆ ئەوەی مێژووی هاوچەرخی کوردی سەرلەنوێ یادی بکاتەوە.

### حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود

لەئەنجامی رووداوو کارەساتەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی دا ئینگلیزەکان توانیان دەسەلاتی سیاسی و فەرمان رەوایی و سەربازی خۆیان بەسەر زەوی یە پانوپۆرە بەپیتەکەی عیراق دا بسەپێنن و بەهاوکاری نێوان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دوا گورزی سەختیان سرەوانە بنچاگوێی ئیمپراتۆری یەتە شلۆقەکەی (عوسمانی)(٢) و بەو مەبەستەی کەلە نەخشەی مێژووی دوای جەنگدا سیماو شوێنەواریان بسرنەوەو دەسگاو یاسایەکی نوێ بەئەنجام بگەیەنن. هەر لەسەرەتاوە ئینگلیزەکان بەدوو چاوی تیژی سەرنج و بیرکردنەوە کەوتنە رامان و وردبوونەوەو سۆراخ کردن سەبارەت بەبارودۆخی ئەو رۆژگارەو پاشەرۆژی ئەم ولاتە. پاش ماوەیەکی کورت گۆرانکاری یەکانی ئەو سەردەمە وایان پێویست دەکرد کە بەو پەری وریایی یەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بارو دۆخەدا بکەن و چارەسەرێك بۆ باشووری کوردستان بدۆزنەوەو شەخسی یەتێکی لەبارو خاوەن پایەو دەسەلات بۆ بەرێوەبردنی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری

دەستنیشان بکەن و لـەم ڕێگەیەشـەوە بتوانن کەتارانەیـەك خۆیـان لـەگرفت و کارەدژوارەکانی ناوچەکە ڕزگار بکەن و سنورێکیش بۆ پروپاگەندەی تورکـەکان دابنێن.

دیارە لەو ڕۆژگـارەداو دوای شەڕی (شوعەیبە)[3]شێخ مەحموودی حـەفید زادە لەهەموو شەخسی‌یەتیکی ئەو سەردەمە زیاتر ناوو شۆرەتی لەسەر زبان بوو، بەم جۆرە دوای لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی لایەنەکانی ئەم مەسەلە گرنگە لـەنێوان لێپرسـراوانی ئینگلـیزدا، جێگـری حوکمـداری گشـتی مەملەکـەتی بەریتانیا لە عیراقدا (ئارنۆلد وێڵسن Arnold Wilson )[4] لـەمانگی تشرینی دووەمـی سـالی ۱۹۱۸ی زایینـی‌دا (مێجـەر نۆیـل Major Noel)[5]ی ڕاسـپارد کەپەلە لەم مەسەلەیەدا بکات و ئەوەی بڕیاردراوە بەجێی بهێنێ، بەم پێیە (لە ۱۹۱۸/۱۱/۱٦دا حـاکمی سیاسـی ئینگلـیز لەناوچـەی کـەرکوکدا، میجـەرنۆیل هاتووەتە سلیمانی و لـە ۱۹۱۸/۱۱/۱۷داو لەئاهەنگێکی جەماوەری سلێمانی‌دا گوتـاری داوەو ئاشـکرا وتویـەتی-بەفەرمایشـتی حـاکمی گشـتی بـەریتانیا لـەعیراقدا مژدەتـان دەدەمـێ ئیـدی سـەربەخۆن و شـێخ مـەحمود حوکمـداری کوردسـتانە)[6] ودواتریـش لـە (۱۹۱۸/۱۲/۱دا وێڵسـن چووەتـە دیدەنـی سلێمانی و لەگەڵ شێخ مەحموددو چل سەر خێڵی کوردستان-هەروەها چەند سـەرخێلێکی ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان کۆبووەتـەوەو هـەردوولا بەڵگەنامـەی دڵنیایی‌یان مۆرکردووە.)[7] ولەهەمان کاتدا (مێجەر نۆیـل بـوو بـەراوێژکاری مەدەنی و دانلیس بەراوێژکاری سەربازی.)[8]

بەم ڕووداوە ناوچەکە جموجولێکی هەست پێکراوی بەخۆیەوە بینی و ژیانی ناوچەکە کەوتە گەڕ، چونکە ئەم وەرچەرخانە مێژوویی‌یە ڕووداوێکی گرنگـی نەتەوایەتی بوو سەبارەت بەبارودۆخی ئەو ڕۆژگارەی باشووری کوردستان و

(هەر لەم ساڵانەدا زمانی کوردی بۆ یەکەمجار بوو بەزمانێکی رەسمی لەکارو باری ناوخۆدا)[٩]

(ئەم حوکمداری‌یە بەفەرمانی وێڵسن-کەسنووری لەزێی گەورە تا دیالە بووەو کەرکوک‌و کفری لێ دەرهاوێژراوە، مێجەر نۆیل راویژکاری حوکمداربووە، حکومەتیکی بێ کابینەی وەزارەت، بێ بوودجەی ساڵانەو گشتی، بێ بەرنامەیەکی دیار بۆ گۆڕینی باری سیاسی‌و ئابووری‌و رۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی بووە، ئەوی لێی دیارە وەك نووسراوێکی رەسمی حوکمدار دەبێژێت- نەشری عیلم‌و فونوون‌و تەرویجی ئەحکامی شەریعەت‌و خیلافەت‌و موحافەزەی ئایینی ئیسلامی‌یە لەژێر حیمایەی دەوڵەتی بەریتانیا، هەروەها دەزگایەکی بچووکی موتەصەریفی‌یەتی کوردو لەشکرێکی بچووکی-لیڤی- لەکوردان‌و بەسەرپەرشتی ئەفسەرانی ئینگلیز پێك هاتووەو کارگێڕو کارمەندەکان لەتورك‌و هاوتایان پاك کراونەتەوەو کوردی بووە بەزمانی رەسمی دەزگاکان‌و حوکومداری کوردستانیش مووچەیەکی ١٥ هەزار روپیەیی بۆ براوەتەوە)[١٠] بەڵام لەگەڵ ئەم بارەناتەواوەیشدا کوردەکان بەخۆشحاڵیەوە پیشوازیان لێکردو بووە مایەی شادمانی‌و رێزلێگرتنی حوکومەتەکە، لەلایەکی ترەوە (ئینگلیز زۆر ترساوە لەبەهێزگرتن‌و پەرەسەندنی حوکمداری یەکە، بۆیە گەرماو گەرم دەستی داوەتە پلان‌و گێچەڵ پێکردن‌و لەسەرەتای مانگی شوباتی ١٩١٩دا کەوتووەتە جێبەجێ کردنیان بۆ هەڵگێڕانەوەی حوکمداری‌یەکەو چەسپاندنی دەسەڵاتی سیاسی‌و سەربازی داگیرخوازانەی خۆرئاوایی لەکوردستاندا.)[١١]

بەگوێرەی بینین‌و بۆ چوونی زۆربەی ئەو نووسەرو سیاسی‌و گەریدەو مێژوو نووسانەی کوردو بیانی کەسەبارەت بەم قۆناغە تایبەتی‌یەی نەتەوەی کوردیان نووسیوەو بەتایبەتی ئەوانەی لەنزیکەوە ئاگاداری ئەو حوکمداری‌یە

کەم خایەنە بوون زۆربەیان لەسەر ئەو باوەڕە یەك دەگرنەوە کە (مێجەر نۆیل) وەك سیاسەت مەدارێکی بەتواناو شارەزایەکی ناوچەکە ویستویەتی کەبەهێمنی و دوور لەهەڵەشەیی و چاو سوورکردنەوە لەگەڵ بارو دۆخەکەدا بگونجێ و تەنانەت (زۆر ڕێزی شێخ مەحمودی دەگرت و هیچی بەبێ پرسی ئەو نەدەکرد، هەر ئەویش بوو کەلە ٢٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩دا یادداشتیکی دابە وێلسن-وتیایدا وتی: ماوەی چوار سەد ساڵە کورد گیرۆدەی دەستی تورکەو هەموو هەوڵێك دراوە کەوەکو گەلێك نەهێڵدرێ و بتوێنرێتەوە.)[12]

ئەم حوکمدارییە زۆری نەخایاند کە ئینگلیزەکان لەو ڕاستییە گەیشتن کەناتوانن شیخی ئەمر دەستەمۆ بکەن و وەك هەندێکی تر رای کێشنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و بۆبەرژەوەندی یەکانی ئەوان هەلسوڕێ و ئەو مافەکەم و کورتەیان بەکورد ڕەوا نەبینیوەو کەوتنە چنینی داوی فروفێڵ و هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی سنووری دەسەڵاتی شێخ و هەڵگێڕانەوەی هەندی تیرەو دەستەو تاقمی ناوچەکەو (لەم پێناوەدا، لەلایەکەوە لە ١٩١٩/١١/١دا بەبیانووی گەشت کردن بەباکوری کوردستاندا-مێجەرنۆیل-ی نەرمی لەحوکمداری کوردستان دوور خستەوەو لەنیوەی شوباتی ١٩١٩دا -میجەر سۆن-ی توندو تیژو ناشنای کوردو کوردستانی لەشوێن دانا، سۆن لە ١٩١٩/٤/٢٤دا گەیشتە سلێمانی و سلاوی لەحوکمداری کوردستان نەکردوو بایەخی پێنەدا، بۆ ئەوە ڕاسپێردرابوو کەناونیشان و دەسەڵاتی حوکمداری کوردستان سووك و تەسك بکات، هەڵبەت بەدامەزراندنی ئەوێ وەك حاکمی سیاسی، نەك ڕاوێژکار وەك نۆیل، ئەوو دەسەڵاتی دژوار لەسلێمانیدا هەڵ کەوت)[13]

(میجەرسۆن)[14] وەك دوژمنێکی نەگریس و داخ لەدڵ سەیری کورد فەرمانڕەوایەتی شێخی نەمری دەکردو لەهیچ کاروبارێکی سیاسی و ئیداریدا

پیکەوە نەدەگونجان، دیارە بەم ئالو گۆڕو وەرچەرخاندنە باشووری کوردستان بەگشتی و ناوچەی سلیمانی بەتایبەتی بێ ئارامی رووی تێکردوو شپرزەیی بەرەنگ و روویەوە دیاربوو، ئەوەتا لێپرسراوە ئینگلیزەکان خۆیان سەبارەت بەم پلان و ئاژاوەیە دەڵێن : (ئینگلیز لەمێژەوە لەوە گەیشتبووکەبەهێز بوونی شێخ مەحموود و فرە بوونی دەسەڵاتەکانی دەبنە مەترسی یەکی زۆر بۆیە نوێنەرانی ئینگلیز فەرمانیان دا کە هەندێ لەدەسەڵاتو توانستەکانی بقرتێنن و قارسی بکەن، ئەوە خیلە کوردی ئازای -جاف-یان لەدەسەڵاتی شێخ دابڕی، بەونیازەش لە نزیکەوە مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ شێخ بکرێت ئینگلیزەکان یەکێکیان وەك یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لەهەڵەبجەدا قووت کردەوە، دابڕین و هەڵوێرانی جاف جەزرەبەیەکی کاریگەر بوو لەدەسەڵاتی شێخ درا)[١٥] بەم جۆرە (ئەو رەنگە زەردو سوورانەی کەداگیرکاری ئەو رۆژە خۆی پێ رازاندبووەوە دەرکەوت کەدیو جامەی ئینگلیزی راوچی بوو کوردی لەکەو بوارا پێ راو دەکرد.)[١٦]

شیخی ئەمر وەك سەرکردەیەکی کورد پەروەرو چاو نەترس بەگومانەوە لەهەڵس و کەوت و رەفتارەکانی (میجەرسۆن) ورد دەبووەوە بێزاری و وەرس بوون لەهەموو لایەکەوە دەمارەکانی هینابووە هەژان و جەستەی دەرزی ئاژن کردبوو، بۆیە بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕا تا بتوانێ جلەوی فەرمانڕەوایەتی لەدەست نەسەنرێ و گورزێکی سەختیش بسرەوینێتە دوژمنانی نەتەوەکەی. لەلایەکی ترەوە پیویستە ئەو راستی یە ون نەکەین کە (یەکێك لەسیفەتەکانی خەباتی رزگاریخوازی کورد بەسەرۆکایەتی شیخ مەحمود ئەوەبوو کە بەپێچەوانەی بزوتنەوەو راپەڕینەکانی تری کوردی کەپێشتر یان لەو سەردەمەدا بوو توانی کەلەچوار چیوەی یەکی تەسکی ناوچەیی خۆی دەربهاوێژی و هەرلەو کاتەوە کەتێکەڵ بەکۆری ژیانی سیاسی بوو بەو پەری

گەیشتە لوتکە، میّجەر سۆن هیچی لەو داخوازی‌یانەی لە حکومەتەکەی شێخ مەحمودەوە پێ‌دەگەیشت جێبەجی‌ی نەدەکردو نەیشی‌دەهێشت کەس بۆ زیارەتی گڵکۆی کاك ئەحمەدی شێخ بچێت. بە شەویش هاتووچۆی لە شارەکەدا قەدەغەکردبوو، هەروەکو خەڵکەکە لە ژێر دەستی ئەواندابن‌و ئەوان ئاغاو کوردیش نۆکەر، بە هۆی تێکچوونی وەزع‌و نارەزایی گەل بەرانبەر بە کردارەکانی ئینگلیز، نارەزایی دەربڕینی ئەمانە هەمووی شێوەیەکی گشتی وەرگرت، کاتێك ئینگلیز زانی وەزعی سلیمانی تێکچووە لیوایەك سەربازی بە چەکی هەمەجۆرەوە هینایە سلیمانی‌و لە نزیك شاخی گۆیژەوە خێوەتیان هەڵدا، شێخ مەحموود کاتێك زانی کارلەکارترازاوە نامەیەکی بۆ دۆستی راستگۆی خۆی میر مەحموودخانی هەورامی نووسی، داوای لێکرد بە ناوی زیارەتی گۆڕی کاك ئەحمەدی شێخەوە لەگەڵ سوپاکەی‌دا کە چوار هەزار چەکدار بوو بگاتە سلیمانی) [٢٣] و هەروەها شێخ لەتیف دریژە بە باسەکەی دەداتو دەڵێت: (لەشکری ئینگلیز ویستیان بێتە ناو شاری سلیمانی‌یەوەو ئاگری بزوتنەوەکە خامۆش کەن، بەلام سوپای کورد لە ژێر فەرماندەی میرمەحمودخانی هەورامی‌دا_ پەلاماری سوپاکەی ئینگلیزی‌داو لە ماوەیەکی کەمدا لە ناویان بردن، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی‌و گوێیان لە دەنگی تەقە بوو بەرەو لای مەحمود خان رۆیشتن بۆ ئەوەی لە شەرەکەدا یارمەتی‌یان بدەن، بەلام پیش ئەوەی بگەنە لایان کۆتایی‌یان بە دوا سەربازی ئینگلیز هینابوو، جگە لە هەندێکیان کە هەلاتن یان دەستگیرکران، کەریم بەگی فەتاح بەگو ئەحمەد بەگی ساحیبقران لەگەڵ ژمارەیەك لە چەکدارانی کورد دوایان کەوتن‌و ژمارەیەکیان لێ‌کوشتن‌و هەندێکیشیان بەرەو کەرکوك هەلاتن... ئەوانەیش کە پیاوانی سیاسی ئینگلیز بوون بە دیلگیران‌و پاریزگاری باش‌و رێزی زۆریان لێگیرا) [٢٤].

لەم کاتەدا شێخی ئەمر بروسکەیەکی بۆ (وێلسن) ی حاکمی سیاسی عیراق ناردو تیایدا وتی: (کورد لە وزەیدا نەماوەو ئیتر بە قسەی ئیوە تەفرە ناخوات، بۆ ئازادی دەستدرایە چەکو گیانی هەموو پیاوەکانتان لە دالدەی خۆمدایەو

بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێت حەقی خۆمان بدەنێ کە ئازادی کوردەو بەڵێنتان بەجێبهێنن) [٢٥] ودوای ئەم بروسکەیە (نامەو ڕاسپاردەی تایبەتی بۆ هەندێ لە سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەی سۆرانو بادینان ناردو کرۆکی مەسەلەکەی تێگەیاندنو بانگی شۆرشی بڵاوکردەوە) [٢٦]

دەربارەی ئەو نامەیەی شێخی ئەمر بۆ خواڵێخۆشبوو (شێخ ئەحمەدی بارزانی) کاك (مەسعود بارزانی) لە کتێبەکەیدا (البارزانی والحرکە التحرریە الکردیە) دا دەڵێ: (کە شێخ مەحمودی حەفید لەمایسی ١٩١٩دا دەستی بە شۆرشەکەی کردو ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان بووەوە، شیخ ئەحمەدی بارزانی نامەی نارد بۆ هەندی لە سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەی بادینان بۆ ئەوەی لایەنی شیخ مەحمود بگرن، خۆیشی هەندێ چەکداری بارزانی بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی برای نارد بۆ ئەوەی بەشداری شۆرشەکەی شیخ مەحمود بکەن، ئەو چەکدارانە لە ناوچەی (دۆلی بیاو) کە بەشیکە لە ناوچەی سورچی یەکان لە ڕۆژهەلاتی بارزانداو بە ڕێگەی خەلیفان_ بارزان_دا تێپەڕینو هەندێك لەوێوەو هەندێکی تریش لە ریگای (باڵەك) موە هەردوو تاقم لە ڕێگادا ڕووبەڕووی هەندی بە کرێگیراوی ئینگلیز بوونە وەو لەو شەرەدا هەندێکیان لێکوژرا، بەلام بەر لەوەی هیزە کە بگاتە سلێمانی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیاندا بەبریندداری بەدیلگیرابوو، [٢٧]

بەم جۆرە بە ئازادکردنی شاری سلێمانیو نەهێشتنی دەسەلاتی داگیرکارانی ئینگلیز لە لایەن مەحمود خانی دزلێیەوە زنجیرەی شۆرشو تێکۆشانی شێخی ئەمرو خانی دزلی لە باشووری کوردستاندا دەستی پێکرد..کەواتە داینەمۆی رزگارکردنی شاری سلێمانی میر مەحمود خانی دزلێ بووەو هەرئەو بوو کە توانی ئەم ئەرکە پیرۆزە مێژوویییە بە ئەمانەتەوە رابپەڕێنی

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی چوارەم:

(١) شێخ مەحمود کوڕی حاجی (شێخ سەعید) ی حەفید کوڕی شێخ محەمەد (بچکۆلە) کوڕی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی (شێخ محەمەد- ناسراو بە شێخ مارفی نۆدێی بەرزنجی) یە، لەبەرئەوەی شێخ سەعید) یباوکی نەوەی کاك ئەحمەدە بە نازناوی (حەفید) ناسراوە، دایکیشی (ئامینە خان)ی کچی (شێخ بابا رەسول)ی بەرزنجیو کچەزای کاك ئەحمەدی شێخ بووە، بە پێی راسترین مێژوو سالی ١٣٠٢ی کۆچی کە دەکاتە ١٨٨٦ی زایینی لە دایك بووەو رۆژی ١٩٥٦\١٠\١٩لەشاری بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

(٢) دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ٦٩٩ی کۆچی ١٢٩٩ی زایینی لە لایەن عوسمان ناوێکەوە بیاتنراوە، لە سالی ١٩٢٢ کۆماری تورکیا هاتە کایەوە.

(٣) لە گەرمەی جەنگی یەکەمی جیهانیداو لە کاتێکدا کە ئیمپریالیستی ئینگلیزی قاچی خستە عیراقەوە، لەژێر سۆزو کاریگەرێتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا شێخ مەحمودی حەفیدزادە بە کۆمەڵێ جەنگاوەری کوردەوە کە بریتیبوون لە رۆڵەکانی داودەو زەنگەنەو دەلۆو هەمەوەندو جافی دەوروبەری کەلار و هەندی لە شێخانی بەرزنجە بەرەو باشووری عیراق بەرێکەوت بەمەبەستی بەرهەڵستیکردنی هێرشو پەلاماردانی ئینگلیزەکان، جەنگو بەرەنگاربوونەوە لە بەرمەیانی رۆژی ١٩١٥\٤\١٢دا لە سێ لاوە دەستی پێکردو دیارە ئەم جەنگەش بۆ پشتیوانیکردنی دەولەتی عوسمانی بوو، بەلام ئەم لەشکرە بە شکستی گەرایەوە دوای ئەوەی کە قوربانییەکی زۆریدا. (بۆ دریژەی ئەم باسە مێژووییە، بروانە دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، گۆڤاری رۆشنبیری نوی، ژ ١٢٥ وەرزی بەهار، ١٩٩٠، ل٣٦، ٣٧

(٤) سیر ئارنۆلد وێلسن Sir Arnold Wilson فەرماندەیەکی سیاسیو سەربازی ئینگلیزەکان بوو، لەگەڵ یەکەم پەلاماردانی ئیمپریالیستی ئینگلیزی بۆ خاکی عیراق لە سالی ١٩١٥دا لە ژێر فەرماندەی (پیرسی کۆکس) هاتە عیراقو پلەی (تەقیب) ی هەڵگرتبوو. دوایئەوەی (پیرسی کۆکس) حاکمی گشتی مەملەکەتی بەریتانیا لە عیراقدا لە (١٥ی ئەیلوول١٩١٨) دا کرا بە سەفیر لە تاران، وێلسن کرا بە جێگری حوکمدرای گشتی مەملەکەتی بەریتانیا لە عیراقدا . دوای شۆرشی ١٩٢٠ی گەلانی عیراقو سەرنەکەوتنی وێلسن لە دامرکاندنەوەی شۆرشەکە برایەوە بۆ بەریتانیا. وێلسن یەکێك بوو لە دوژمنە

سەرەکی‌یەکانی شۆڕشی کوردو سەرۆکەکەی، زۆربەی پرۆژەو بۆچوونو داخ لە دڵیتی بەرانبەر بە شیخ مەحمود.

بە روونی لە نووسینو یادداشتەکانی‌دا دیارە، بۆ ئەم مەبەستەیش بڕوانە:

Wilson A.T.Loyalities Mesopotamia 1914- 1917. Personal and historial record, London, 1930

Wilson A.T.M esopotamia 1917-1920, Actash of loyalities, London, 1931

سەیر لەوەدایە (ویلسن) باسی ئازایەتی‌و راستگۆیی شێخی ئەمریش دەکات.

(٥) سەرچاوە ئارشیفی‌یەکانی بەریتانیا ئەوە دەگەیەنن کە (میجەر نۆیل) ئەکادیمی‌یەی سەربازی لە ئینگلتەرە تەواو کردووەو لەگەڵ کاروباری سیاسەتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا کاری کردووە

(٦) کەمال رەووف محەمەد، گۆڤاری رامان، ژ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩، هەولێر.

ئەحمەد تەقی لە یادداشتەکەی لەم باسە دواوە، بڕوانە: خەباتی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی‌دا، رێکخستنو ئامادەکردنی بۆ چاپ، جەلال تەقی، بەغداد، چاپخانەی سلمان الاعظمی، ١٩٧٠، ل٢٣.

بەلام ویلسن لە کتیبەکانی‌دا وشەی (حوکمدار) بەکارناهێنێتو سەرچاوەی تری بەریتانیا دەڵێن (شێخ مەحمود تەنیا بەڕێوەبردنی شاری سلێمانی پێ سپێرراوە، لە لایەکی ترەوە W.R. Hay لە یادداشتەکانی‌دا وەك کاربەدەستێکی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی لە کوردستان ساڵانی ١٩١٨-١٩١٩ ئیشارەت بۆ دانانی شیخ مەحمود دەکات بە حوکمدار بۆ ئەمەیش بڕوانە:

Hay W.R .Two years in Kurdistan, Experiences of political officer (1918- 1920, London, 1921)

(٧) کەمال رەئوف محەمەد، هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٨) عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کوردو کوردوکۆماری عێراق، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٩، ل٨٢

(9) Edmonds, Kurds Turks and Arabs, London, Oxford University press, p.11.

(١٠،١١) کەمال رەئوف محەمەد، گۆڤاری رامان، ژ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩

لیرەدا پیویستە ئەو راستی‌یە تۆماربکری کە نووسەر کەمال رەئوف محەمەد بۆ یەکەمجار بە بەڵگەوە ئەو راستی‌یەی خستە روو کە رۆژی ١٩١٨\١١\١٧ رۆژی دامەز راندنی یەکەم حکومەتی شێخ مەحمودە، نەك ١٩١٨\١١\١ کە لەمەوبەر باس‌کراوە. بۆ ئەمەیش بروانە: کوردستانی نوی، ژ ١٤٢٤ رۆژی ١٩٩٧\٧\١٠

(١٢) خەباتی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی‌دا ، رێکخستن‌و ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بەغداد، ١٩٧٠،ل٢٤

(١٣) کەمال رەئوف محەمەد، گۆڤاری رامان، ژ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩

(١٤) ئیلی بانستەرسۆنEly Bannister Soone لە رۆژی (١٦) ی ئابی سالی ١٨٨١ لە (کنزکتن Kensigton) ی ئینگلتەرە لە دایك بووە، بەو بۆنەیەوە کە حەزی لە فیربوونی زمان کردووە بە تایبەتی زمانەکانی‌رۆژهەلات، سالی ١٩٠٢ دوای تەواوکردنی خوێندنی بالا چووە بۆ ئێران‌و لە بانکی شاهەنشاهی دامەزراوە، لە دوایی‌دا شارەکانی (یەزدو بوشەهرو شیراز) یش گەراوە، ئینجا بووە بە سەرۆکی بانکی کرماشان‌و سالی ١٩٠٧ وازی‌هێناوە، سالی ١٩١٦ کراوە بە جێگری کونسولی بەریتانیا لە دیزفول، لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی‌دا بەریوەبردنی نارچەی خانەقین‌و نەوتەکەی پی سپێرراوە، سالی ١٩١٩ کە ئینگلیز نارچەی سلیمانی داگیرکرد بووە بە حاکمی سیاسی، لەو سەردەمەدا کە لە نارچەی سلێمانی‌دا ژیاوە سەرپەرشتی رۆژنامەی (پیشکەوتن) ی کردووەو پێشتریش لە رۆژنامەی (تیگەیشتنی‌راستی) دا بەشداری‌یەکی کارای کردووە. سۆن یەکێك بووە لەو کەسانەی کە بە زوویی فیڕی زمانی کوردی بووەو بە رەوانی پیّی نووسیوە، مێژوونووسی بە ناوبانگ (ئەمین زەکی بەگ) لە کتیبێی (خلاصەیەکی‌تاریخی کوردو کوردستان-جلدی اول-جزئی دووەم- بەغداد، ١٩٣١، ل٢٩١) لە بارەی (میجەر سۆن) ەوە ئەلیت (میجەرسۆن بە قەدەر کوردیك کوردی دەزانی‌و لە عالمێکی کورد زیاتر شارەزای زمانەکەمان بوو).

سۆن لە سەرەتای کارکردنی‌دا لە نارچەکانی رۆژهەلات بە ناوی (میرزا غولام شیرازی) یەوە خۆی بە خەڵك ناساندووەو ئەستی بە گەڕان کردووەو دواتر یادداشتەکانی خۆی نووسیوەتەوەو ئەم راستی‌یانەی وتووە - سەرەرای ئەمانە (سۆن) خاوەنی گەلی بەرهەمە سەبارەت بە زمانی کوردی‌و نارچەکە، لە ٢٤ی شوباتی ١٩٢٣ دا کۆچی دوایی کردووە دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بۆ خزمەتی سیاسەتی ولاتەکەی هەڵسوراوە.

(١٥) بڕوانە (کوردو کوردستان) نووسینی دەستگایەك لە پسپۆڕانو نەفسەرانی سیاسی‌ئینگلیز، ئەم کتێبە ساڵی ١٩٢٣ لە فەلەستین بە ئینگلیزی چاپکراوە و لەم ساڵانەی دواییدا لە لایەن (حسین ئەحمەد جافو حسین عوسمان ئیرگسە جاری) یەوە کراوە بە کوردیو تا ئێستا بە دەستخەتی ماوەتەوەو چاپ نەکراوە.

(١٦) محەمەد رەسوڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بە رگی یەکەم، ١٩٩٠، ل٢٩٧، چاپی لەندەن

(١٧) الدکتور کمال مظهر احمد، وثائق و حقائق جدیده حول حرکات الشیخ محمود، التاخی، العدد ١٤٥٤، (١٩٧٢\١٠\١٨)

(١٨) شێخی نەمری بەرزە قارەمان لە سەرەتای ژیانی سیاسی‌یەوە سەبارەت بە گەیاندنی دەنگی کوردو جوڵانەوە رزگاریخوازەکەی بە گەلانی جیهان سستی نەکردووەو چەندین جار هەوڵی فەرهادانەی داوە، ئەوەتا لە کۆتایی نیسانی ١٩١٣دا ئەحمەد بەرزنجی نوینەری نارد بۆلای کونسوڵی رووسی لە موسڵ کیرسانوف،پاش ماوەیەك لە کانوونی دووەمی ١٩١٣دا هەمان نوینەری خۆی ناردبوو بۆ لای دیپلۆماسی‌یەکانی رووس لە بەغداد کە یەکێکیان (نارلۆن) بوو. لە مانگی مارتی ١٩٢٣دا نامەیەکی نارد بۆ کۆمەڵەی گەلان (عصبە الامم) لە ریگەی نوێنەری تایبەتی‌یەوە لە تارانو تیایدا وتویەتی: (ئێمە کە دانیشتوانی کوردستانی‌خوارووین لە جەنگی جیهانی‌یەوە داوامان لە ئینگلیز کردووە کە دان بە مافەکانماندا بنێ، بەڵام هێزەکانی ئینگلیز دەستاون بە خاپوورکردنی وڵاتو ریگە نادەن کە دەنگی نارەزاییمان دەربڕین. دانیشتوانی کوردستان ئیمرۆ لە ژێر بۆردومانی هیزی سوپادا دەژیو دووسەد خیزان ناچاربوون کە شاری سلێمانی جێبهێڵن. ئێمەیش پەنادەبینە بەر دادو مرۆڤایەتی کە دژی ئەم ستەمو ئازاردانە بووەستن). ئەمە جگە لەوەی کە لە رۆژی ١٩٢٣\١١\٣٠ بە هۆی کونسولی سۆڤیەتی لە تەوریز نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی دەوڵەتی شووەوی کردووە، بەڵام ئەم نامەو داواکارییانە زۆربەیان بی وەڵام ماونەتەوە بە تایبەتی ئەو نامەیەی کە بۆ (لینین) نێرراوە.

(بۆ هەندی لە زانیاری‌یەکانی ئەم پەراویزە بروانە سەرچاوەی پەراویزی پیشوو).

(١٩) ئەحمەد خواجا چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغداد ١٩٦٨، ل٣٧

(٢٠) محەمەد رەسوڵ هاوار، شێخ مەحمودی قارەمانو دۆڵەتەکەی خواری کوردستان، بەرگی یەکەم، ١٩٩٠، لەندەن،ل ٤٤٠، ٤٤١

(٢١) بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ١١٣، مارتی ١٩٨٧، ل٧٢

(٢٢) تا ئێستاش لە سەرشاخی بڵندی گۆیژەی شاری سلێمانی شوێنەواری سەنگەرەکەی مەحمود خانی دزلی ماوەو هەر بەناوی (مەحمود خان) ەوە بە ناوبانگە.

(٢٣،٢٤) یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفیدزادە، چاپکردنو پێشەکی شیخ مەحمودی کوڕی شیخ کاوە، چاپی یەکەم، ١٩٩٥، ل٥٢

(٢٥) ئەحمەد خواجا، چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، ١٩٦٨، ل٣٩

(٢٦) سەبارەت بە نامەکەی شێخی ئەمر بۆ ناوچەی بادینان، شێخ باباعەلی شێخ مەحمود بۆ کاك (محەمەد ڕەسوڵ هاوار) ی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: (ئەو نامەیەی کەباوکم بۆ شێخ ئەحمەدی بارزانی ناردبووی بە- فەخری بەگی واصف بەگ- دا دەینێرێ‌و کە فەخری بەگ دەگاتە بارزان شێخ ئەحمەد لەوێ نابێ‌و دوای سێ ڕۆژ نامەکەی دەداتێ.

(٢٧)مسعود البارزاني، البارزاني والحركه التحرريه الكرديه، ١٩٣١-١٩٣٢، كردستان، ١٩٨٦، ص٢٢.

***

## بەشی پێنجەم

# خانی دزلی و جەنگی مێژوویی دەربەندی بازیان

دوای ئەوەی کە (مەحمودو خانی دزلی) شاری سلێمانی لەچنگی داگیرکارانی ئینگلیز رزگارکردو سوپاو دەستوپێوەندەکانی دەرپەڕاندو کلیلی سەرفرازی شارەکەی دایە دەست شێخی نەمر، دیارە ئەم رووداوە کوت و پڕە مێژوویی یە گورزێکی کوشندەبوو ئاراستەی گازرای پشتی داگیرکاران کراو تۆڵە سەندنەوەیەکیش بوو لەرەفتارەکانی -میجەرسۆن- و جارێکی تر سەلماندیان کەنەتەوەی میدیاو کەی ئەخسەر بەئەلهاو خۆشحاڵی یەوە بەدوای ئازادی و بەختەوەری دا وێڵەو قوربانی بۆ ئەدات. (هەرچەندە لەبەر نەبوون و برینی هێڵی تەلگراف هەواڵەکانی دوای سێ رۆژ گەیشتنە بەغدا)[1] و کاربەدەستانی ئینگلیزیش بەتەواوی لەمەسەلەی رزگارکردنی شاری سلێمانی گەیشتن. لەم کاتەدا مەلیک مەحمودو دۆستە هاوپەیمانەکانی لەو راستی یە گەیشتبوون کەئینگلیزەکان وەك هێزێکی گەورەو وڵاتێکی داگیرکار بەم شکستی یە قایل نابن و بەئاسانی دەست لەکوردو ناوچەکە هەڵناگرن و بارگەو

بنەیان ناپێچنەوەو دەیانەوێ بەهەر ڕێگایەك بێ سەر لەنوێ جڵەوی دەسەڵات و زەبروزەنگی خۆیان بگرنەوە دەست.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوون و بیرکردنەوەیەدا ژمارەیەك لەجەنگاوەرە دلسۆزەکانی کوردو بزوتنەوە شۆڕشگێڕانەکەی بەرەو ڕێگای کەرکوك بەرێکەوتن بەمەبەستی پاراستنی شاری سلێمانی و بەربەستکردنی هێرش و پەلاماردانی دوژمن، (ئەم جەنگاوەرانە کەمەردەستەو تاقمێکیان لەشوێنێکەوە هاتبوون لەچەند جێگایەکدا خۆیان بەست و ئامادەی جەنگێکی خوێناوی بوون.)[٢]

لەسەرەتادا (یەکەم شەڕی قورس لەنێوان هەردوولادا لەتاسلوجە قەوما، لەم شەرەدا ئینگلیزەکان شکان، بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان چوار زرێپۆش و نۆزدە ئوتومبیلی فۆردیان تێکشکێنران. دوای سەرکەوتنی تاسڵوجە شۆڕشگێڕانی کورد ترسیان شکاو خۆیان بۆ کەرکوك ئامادەکرد، ئینگلیزەکانیش بۆ تەمبێی کوردو تۆڵەی تاسلوجە کەوتنە خۆ، هێزێکی زۆریان لەکەرکوك گەڵاڵەکردو بەچەك و تفاقێکی زۆرەوە رەوانەی سلێمانی یان کرد، ژەنەراڵ فریزەر کرا بەفەرماندەی ئەو هێزە کەئینگلیزەکان ناویان لێنابوو (هێزی کوردستانی باشوور) شۆڕشگێڕانی کوردیش بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود بەرەو کەرکوك کەوتنە ڕێ و کەبەهێرشی هێزەکەی ژەنەراڵ فرێزەریان زانی خۆیان لەمدیوی دەربەندی بازیان قایم کرد.

ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی سالی ١٩١٩ هێزەکەی ژەنەراڵ فریزەر لەکەرکوکەوە کەوتە ڕێ و لای ئێواری گەیشتنە نزیك دەربەندی بازیان، دوای ئەوەی تاریکایی داهات بەپێی نەخشەو پلانێکی سەربازی ورد بەشێکی زۆری ئەو هێزە، بێ ئەوەی ئەودیو هەست بەمدیو بکات بەشاخ و گردو تەپۆڵکەکاندا هەڵگەڕان، تۆپە دوورهاوێژەکانیشیان سەنگەری لەبازیان لێدا، بەرەبەیانی

ڕۆژی داهاتوو ئەو هێزە گەورەیە لەناکاودا کەوتە هێرش و لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەموو شتبڕایەوە، شۆڕشگێرانی کورد زۆر خراپ شکان، چل و هەشت کەسیان لێ شەهید بوو، ژمارەیەکی گەلێك لەوە زۆرتریان لێ بریندار بوو، یا بەیەخسیری کەوتنە دەست ئینگلیزەکانەوە، شێخ مەحمود بۆ خۆی یەکێك بوو لەوانەی بەبرینداری لەژێر تاشەبەردێکی گەورەدا دیل کرا، خەڵکی دوایی ئەو تاشەبەردەیان ناونا(بەردەقارەمان)[٢].

ئێمە لێرەدا نامانەوێ سەربوردیکی سەرتاپاگیری جەنگی خوێناوی (دەربەندی بازیان) بەسەربکەینەوەو بچینە کرۆکی سەرجەم کەلێن و بەسەرهات و ئەنجامەکانی پێش چاو بخەین چونکە پێویستی بەلێدوانێکی فرە هەیە، بەلام هێندە دەڵێین کەبەهیچ جۆرێك یەکسانی لەنێوان هێزەکانی ئینگلیزو جەنگاوەرەکانی کورددا نەبووەو نەخوازەلا شارەزایی ئینگلیزەکان و دەستکورتی جەنگاوەرانی کورد لەبواری سەربازیو پێویستی و پلانی جەنگدا. چونکە سوپاکەی ژەنەراڵ فریزەر *(پێکهاتبوو لەتیپی یەکەمی لەشکری پێنج کەبەتیپی سووری ڕۆژهەلات بەناوبانگ بوو، بەتالیۆنی پیادەی بۆرمایی لەتیپی ٨٥و بەتالیۆنی پیادەی یەکەمی پەنجابی لەتیپی ٨٧و بەتالیۆنی یەکەمی مەهراتی لەتیپی ١١و پەل یەکەمی بەتالیۆنی ٤٩ی پیادەی پەنگالیو پەل ٢٣٩ی بەتالیۆنی ١١٨ی هیندی مەترەلۆز، تۆپخانەکەیشی پێکهاتبوو لەبەتەرییەی ٢٥ی چیایی هیندی کەبریتیبوو لە ٤-٦ تۆپی چیایی کەبەکۆلی ئێستر دەگوێزرانەوەو چەند پارچەیەکی بەتەرییەی -ب-و-هـ-ی کەتیبەی ٢٣٦ی تۆپخانەی میکانیکی شاهانە، هێزی ئاسمانی شاهانەیش تەرخان کرابوو بۆ دابینکردنی ئەرکی هەوالزانیو پشتگیریی ئاسمانی، چەند ڕەگەزێکیش لەبەشی موخابەرەو ئەندازیاریو هەوالزانی و سوارەو زرێپۆش پشتی ئەم هێزەیان ئەگرت و کۆمەڵە بەرێوەبەرێکی لێهاتووی*

*وەك كارمەندانی پزیشكیو ئازووقەو چەك پێدەرو ئاو بۆدابینكردنیشیان بۆ ئامادەكردبوو، هەروەها ستافێكی ئەركانی بەتوانایان بۆ دانابوو، ئەفسەری سیاسی كارامەیان خستبووە پاڵ كەلە سەرەتادا -میجەرسۆن- لەوێبوو پاشان میجەر ئەدمۆنس-ی هاتەجێ)*[١] *بەڵام (هێزی شۆرشی كوردیش بەسەرۆكایەتی شێخ مەحمود پێكهاتبوو لەكۆمەڵێ جەنگاوەری عەشایەری بەرزنجەو جافو هەورامانی ئێران تێكەڵ لەگەڵ هێزێكی نیوەمەشق پێكراوی لیویو تفەنگی جۆراوجۆری كۆنو خەنجەر بەدەست كەلە ٣٠٠ كەس تینەدەپەرینو هەندێكیشیان ئەسپیان لەژێردابوو)*[٥] لەلایەكی ترەوە(كەس بەرادەی ئەوان -واتا ئینگلیزەكان- شارەزایی كۆنو كەلەبەری سەختترینو كەلاترین شوێنی كوردستان نەبوو، ئەوان لەسەدەی شازدەمینەوە كەوتبوونە كۆكردنەوەی زانیاری دەربارەی كوردو وڵاتی كوردان، هەر ئەو میجەرسۆنەی كەلەو رۆژانەدا حاكمی سیاسی سلێمانی بوو سەرەتای سەدەی بیستەم چەند مانگێكی بەناوی بازرگانێكی شیرازییەوە لەناو كوردی سلێمانیو دەوروبەریدا بردبووە سەر بێ ئەوەی كەسێك هەر بزانێ كێیەو كێ نییە، بە پێ دەربەندی بازیانی بڕیبوو، ئینگلیزەكان لەو سەردەمەدا بەلایەنی كەمەوە سەدانو سەدان نەخشەی وردی كوردستانیان لەبەردەستدابوو، شوێنەمابوو نەخشەی نەكێشن، هەموو شارو شارۆچكەو گوندو شاخو داخو گردو تەپۆڵكەو دارستانو گۆمو رووبارو جۆگەی كوردستانیان بست بە بست پێوابوو، ناوی هەر گوندێك لەگوندەكانی كوردستان لەناو هەركام لەبەڵگەنامە ئینگلیزییەكاندا هاتبێ شوێنە كەی لەسەر نەخشە بەسانتیمو ملیم دەستنیشان كراوە، چ جای دەربەندێكی مێژوویی ناسراوی سەر رێ وەك دەربەندی بازیان كەسەرباری هەر شت ناوچەیەكی زۆر سەخت نییە، پێم وایە بەرزایی لوتكەی هەرەبڵندی لەچوار هەزار پێ تێناپەرێت، لوتكەی سەركەشی

پەرەمەگرون نەبێت زۆر بچەمێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت نەوازشی خۆی عەرزی بەردەقارەمان بکات)[٦].

ئەو سوپایەی کەبەفەرماندەی سەردار کورد (شێخ مەحمود) بەرەو تاسلوجەو دەربەندی بازیان و رێگای کەرکوك کشا بریتی بوو لەو تیرەو هۆزانەی کەبەراستی دۆستی نزیکی شێخی نەمربوون و دەستەیەك گەورەپیاوو کوردپەروەریان لەگەڵدابوو کەهەر لەسەرەتاوە لەریزی پێشەوەی دڵسۆزەکانی بوون و خۆیان بەبەشێکی دانەبراوی بزوتنەوەکە زانیوەو بەفرۆفێڵی بێگانە سەنگەری نەتەوایەتی یان چۆڵ نەکردووەو ئامادەی قوربانی دان بوون وەك (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند)[٧] و(سەید محەمەدی جەباری)[٨]و (شێخ عەلی قەلبەزە)[٩]و (شێخ عەبدولقادری گۆپتەپە- گوللەنەبی)[١٠]و شێخ حسێنی شێخ عەبدولقادری کەسنەزان)و چەند دلسۆزێکی تر. بەلام جگە لەم گەورە پیاوانەو چەند تیرەیەکی ئازای کورد (ژمارەیەکی زۆری ئەم سوپایە لەجەنگاوەرەکانی مەحموودخانی دزلی پێك هاتبوو)[١٢] چونکە بەقسەی نوسەرانی کوردو مێژوونووس و گەریدەکانی بیانی و یادداشتە دەستخەتەکانی خوالێخۆشبوو (باباعەلی شیخ مەحمود)و (شێخ رەئوفی شێخ مەحمود)و ناوراپۆرتە نهێنی یەکانی ئەفسەرو لێپرسراوانی ئینگلیز سەرجەم لەوە دوان کە (مەحمود خانی دزلی) لەپێشرەوی ئەو کەسانەدابوو کەبەگیان و دڵ هاوکاری یان کردووەو بۆ ئەم راستی یەش بەیاننامەکانی ئەو سەردەمە کەزۆربەیان لەکۆڕی جەنگدا دەرچوون باشترین بەڵگەو شایەتی رۆژگارن:

*١- بەیاننامەی ژ (٣) کەمێژووی بەسەرەوەنی یەو شێخی نەمر بڵاوی کردوەتەوەو تیایدا دەڵێ: (هێزی پیادەی هەورامی بەفەرماندەی عەبدوڵلابەگی دزلی لەبانی مەقان بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون و دوژمن پەرێشان کراو ئێمەش یەکێکمان بریندارە.)*[١٣]

*٢- بەیاننامەی ژ (٤) (دووەم شەوە هەورامی دزلیو دوژمن لەقەرەهەنجیر لەجەنگدان، ئەمرۆ سوارەی مەنمیو هەمەوەندیش ئاوێتەیان بوون و لەدوژمن کوشتار زۆرەو تالان زۆر گیراوە، پێنج لەهەورامیو دوو لەمەنمیو بیستو دوو بریندار هاتووەتەوە.*

*٣- بەیاننامەی ژ (٥٠) رۆژی ١٩١٩/٦/١٨ (بەفەرماندەی ژەنەراڵ فریزەر هێزیکی گەورە لەموسڵەوە گەیشتە کەرکوك، لەکەرکوکیشەوە هێزیك بەفەرماندەی -تۆمسن- گەیشتە چەمچەماڵ، کارچەتوونە، سوپاو هێزی عەشایەر لەسووپەردا ئامادەی جەنگنو دوژمن زۆر بەهێمنی دێت[14].*

دیارە بەیاننامەی ژ(٥٠) دوابەیاننامەی بارەگای جەنگی شێخی نەمربووە، هەر لەو رۆژەدا سوپاکەی ژەنەراڵ -فریزەر بەیارمەتی فرۆکە جەنگیەکان ئابلۆقەی جەنگاوەرانی کوردیان‌داو شکستی رووی لەسوپاکەی شێخی نەمر کردو خۆیشی لەپاڵ بەردەقارەماندا بریندار دەکرێو دەکەوێتە دەست سوپای دوژمنو بەو برینداریەیە بەرەو بەغدا بەرێدەکرێو لەوێ دەدرێ بەدادگایەکی سەربازیو لەرۆژی ١٩١٩/٧/٢٥دا حوکمی خنکاندنی بەسەردا دەدرێو بەلام دواجار حوکمەکە دەگۆڕن بەحوکمی ئەبەدیو رەوانەی هیندستان دەکرێ. سەبارەت بە (مەحمود خانی دزلی)ش یەکسەر دوای ئەو نوشوستی‌یە بەخۆیو جەنگاوەرەکانی‌یەوە خۆی دەگەیەنێتەوە چیا سەرکەشەکانی هەورامان بۆ درێژەدان بەخەباتی شۆڕشگێڕانەیو نەکوژاندنەوەی ژیلەمۆی ئەو شۆڕشە، ئەوەتا کاربەدەستیکی کۆلۆنیالی بەریتانی لەکوردستان سالانی ١٩١٨-١٩٢٠ کەکاپیتان (Hay)ەو حاکمی سیاسی ئینگلیز بووە لەهەولێر دەڵێ: (شۆڕشەکەی شیخ مەحمود لەساڵی ١٩١٩دا هەرچەند بەنوشوستی کۆتایی هات بەلام دەری‌خست کەدەتوانرێ بەربەرەکانی ئەم حوکومەتە تازەیە بکرێ)[15] و دیارە لێرەدا مەبەستی Hayحوکومەتی ئینگلیزە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم:

١-Waheed.A. The Kurds and their countries. A history of the kurdistan people. (From earliest times to present) Lahor. 1955- P.159.

٢- زۆربەی جەنگاوەرەکانی شێخی نەمر بریتیبوون لەدانیشتوانی ئەو گوندانەی کەسەر بەشێخ بوون وەك ناوچەکانی شاربازێرو قەرەداخ و بەرزنجەو قەرەحەسەن و چەمچەماڵ و هۆزەکانی هەمەوەندو جەباریو سمایل عوزەیریو روغزاییو قەرەوەیسیو کانی کەوەییو شێخ بزەینیو عەشایەری غەوارە کەبریتیبوون لە بێسەریو چوورچانیو ناوداریو شێخ سمایلیو پەرخیو زۆری تریش.

٣-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، گۆڤاری رەنگین، ژ(١٠٢)، سالی ١٩٩٢.

٤-لیوا روکن محمد ئەجمەدین نەقشبەندی، گۆڤاری رەنگین، ژ (١٠٥) تشرینی یەکەمی ١٩٩٧.

٥-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦-دکتۆر کەمال مەزهەر، گۆڤاری رەنگین، ژ١٠٢، سالی ١٩٩٢.

٧-کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، سەردەستەی قارەمانانی شۆرشی مەلیك مەحمود بووەو لەسەرەتاوە تا کۆتایی ژیانی بەخەمخۆرو دڵسۆز ماوەتەوە. لەشۆرش و بزوتنەوەکانی شێخی نەمردا دەورێکی بالآی بینیوەو نموونەی شۆرەسوارێکی دلێری راستەقینەی کوردپەروەربووەو داگیرکارانی ئینگلیز بەقەد شێخ مەحمود سڵیان لەم گەورە پیاوە کردووەتەوە، تەنانەت لەدۆکیومەنتی ژ: 22 No.831.c.o:ی رۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣ی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ئەوە وتراوە کەپاداشتێکی دەهەزار روپیەی تەرخان کراوە بۆ گرتن یان کوشتنی کەریم بەگی هەمەوەندو رۆژنامەی (پێشکەوتن)ی سەر بەداگیرکارانی ئینگلیز لە ژ١١٢ رۆژی ١٩٢٢/٦/٢٢دا ئەم ئاگادارییەی لەلایەن حاکمی سیاسی ئینگلیزەوە بلاوکردۆتەوە. حاجی میرزا عەبدوڵلای خەیاتی سەقزی (غەرقی) لەشیعرێکیدا سەبارەت بەو رۆژگارە بەرێزەوە ناوی ئەم قارەمانە دەهێنێ:

بۆ کۆمەك و یەك رەنگی حەقەن کەریم بەگ

بێ میسل و نەزیریوو لەجیهاندا کەوەهایە

ئازایەتیو چاونەترسیو دڵسۆزی ئەم پیاوە گەورەیە لەچەندین بابەتی ئەدەبیو بەیت و بالۆرەو شیعری فۆلکلۆری ئەو سەردەمەدا رەنگی داوەتەوە. ئەم رۆڵە نەبەردە لەمانگی

تەمموزی ساڵی ١٩٢٦دا لەلایەن چەند کەسێکەوە شەهید دەکرێو هەواڵی شەهید کردنیشی لەرۆژنامەی (ژیـان)ی ژ٢٤ی ڕۆژی ١٥ی تەمموزی ١٩٢٦دا بڵاوکراوەتەوە کەلەگوندی (قەرەتامووڕ) شەهید کراوە، مەزارەکەیشی لەتەنیشت (شێخ ڕەزای دێلێژە)وەیە.

لێرەدا پێویستە ئەوەیش بڵێین کەهەمەوەند تیرەیەکی ئازاو دلێری کوردن و لەشەڕو شۆڕی ناوخۆو دەرەوەدا ئافرەت لەگەڵیاندا بەشداری کردووەو ئەم تیرەیە لەبنەڕەتدا لەدەوروبەری ساڵی ١٧٠٠ی زایینیدا لەناوچەی (سنە)وە هاتوون و لەدەورووپشتی بازیاندا گیرساونەتەوەو شاعیری ناوداری ناوارەی دەستی داگیرکاران (فەقێ قادری هەمەوند) سەر بەم تیرەیەیە.

٨-سەید محەمەد کوڕی سەید سەمەدە لەساڵی ١٢٩٧ی کۆچیدا لەدێی (مەحمود پەریزاد) کەلەلادێی (قادرکەرەم)دایە لەدایکبووە، لەتەمەنی دەساڵاندا چووەتە بەر خوێندن و زمانی عەرەبیو تورکی بەباشی فێربووە، پاش تەواوکردنی خوێندن بارکی جڵەوی هەموو کاروبارێکی هۆزەکەی داوەتە دەست، سەید محەمەد لەناو هۆزی (جەباری)دا مایەی ڕێزو خۆشەویستیو سەنگینیبووە.

لەسەرەتای شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمودەوە بەخۆیو بنەماڵەو هۆزەکەیەوە بەشداری کردووە بەچەشنی فەرماندەیەکی بەتواناو دڵسۆزو بەئەمەك دەوری پرشکۆیی بینیوە، ساڵی ١٩٢٢ داگیرکارانی ئینگلیز دوو هەزار ڕووپیەیان بەپاداش داناوە بۆ گرتن یان کوشتنی ئەم پیاوە گەورەیەی کورد، بەیاننامەکەیش بەئیمزای مەندوبی سامی لەڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژ ١١٣ی ڕۆژی ١٩٢٢/٦/٢٢دا بڵاوکراوەتەوە.

سەید محەمەد هەتا کۆچی دوایی کرد لەسەرباوەڕی پیرۆزو نەگۆڕی خۆی مایەوەو دڵسۆزی کوردو شۆڕشەکەیو شێخی نەمربوو، ئەم شۆڕشگێڕە نەبەردە ساڵی ١٣٥٤ی کۆچی کەئەکاتە ١٩٣٥ی زایینی کۆچی دوایی دەکات

٩-شێخ عەلی قەڵبەزە ساڵی ١٨٩٠ی زایینی لەئاوایی (شیوی قازی) سەربە ناوچەی (قەرەداغ) لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەرو ئایینیدا چاوی کردووەتەوە، سەرەتا لەقوتابخانەکەی باوکیدا کەقوتابخانەی ئایینی (شێخ عەبدولرەحیم)ی (شیوی قازی) بووە ڕووی لەخوێندن و نووسین و بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کردووە، لەڕۆژگارێکدا کەوتووەتە ژیانەوەو پێگەیشتووە کەسەرەتاو چووزەرەی بیروباوەڕی کوردایەتی و هەستی نەتەوایەتیو هەوڵو خەباتی شێخ مەحمودی حەفید زادەی بەرزنجی لەگەشانەوەو

بالاکردندا بووە، بەم پێیە بیروباوەڕی کوردایەتیو بەشداریکردن لەخەباتی نەتەوەکەیدا لەدڵو دەروونیدا قوڵپیداوەو کاتێکیش کەشێخی نەمر لەساڵی ١٩١٩دا لەدەربەندی بازیان بەرانبەر بەداگیرکارانی ئینگلیز وەستا (شێخ عەلی قەڵبەزە) یەکێک بوو لەبەشداربووەکانی، لەدوای بڕانەوەی شەڕەکەیش خۆ بەدەستەوە نادات‌و لەناوچەکانی (قەرەداغ)و (شارەزوور)دا درێژە بەخەبات دەدات، پاش ماوەیەک (مەحمود پاشای جاف) لێبوردنی بۆ وەردەگرێو لەناوچەی شارەزوور نیشتەجێی دەکەن‌و چەند گوندێکیشی دەدەنێ وەک (قەڵبەزە)و (بیسەلمێن)و (دەڵەر)و ماوەیەک لەگەڵ براو خزمو کەس‌و کاریدا لەشارەزوور دەمێنێتەوەو دەبێتە جێگەی بڕواو متمانەی (مەحمود پاشای جاف)و خەمخۆری دانیشتوانی ناوچەکە.

لەکاتێکدا هەواڵی گەڕانەوەی شێخی بەردەقارەمان لەناو جەماوەردا بڵاودەبێتەوەو شێخی نەمر لە (کویت)ەوە بەرەو بەغداو سلێمانی بەڕێدەکەوێ (شێخ عەلی قەڵبەزە) یەکێک دەبێ لەو دڵسۆزانەی لەم پێشوازییەدا بەشدار دەبێ‌و بەگەیشتنەوەی سەرلەنوێ دەبێتەوە بەدڵسۆزەکەی جارانی.

دوای کارەساتی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ی شاری سلێمانی بەماوەیەک شێخی بەردەقارەمان بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ڕژاوی ڕۆڵە بێتاوانەکانی کورد بەرەو کەرکوک دەکشێ‌و کۆمەڵێ لە شۆڕشگێڕە بەوەفاکانی لێکۆدەبێتەوەو بەشداری ئەم خەباتی نوێیە دەکەن‌و شێخ عەلی قەڵبەزە یەکێک ئەبێ لەو دڵسۆزانەو لەشکرەکە لەگوندی (ئاوبارێک)ی بناری (گل)ی سەریە (قادرکەرەم) بەرانبەر بەسوپای داگیرکارانی ئینگلیزو خۆفرۆشانی کورد دەبێ‌و دوای جەنگێکی قارەمانانەی خوێناوی شێخ عەلی قەڵبەزە لەئێوارەی ڕۆژی ١٩٣١/٤/٥دا بەهۆی فرۆکەی دوژمنەوە دەپێکرێو خوێنە ئاڵەکەی لەو ڕۆژەدا دەبێتە ڕەمزی خەبات‌و شۆڕش‌و شەهیدی ئاوبارێک.

١٠-شیخ عەبدولقادری گۆپتەپە کەبە (گوللەنەبڕ) ناسرابوو کوڕی (شێخ حەمە سالح)ی گۆپتەپەیەو یەکێک بووە لەهاوەڵو دڵسۆزانی شێخ مەحمود، لە (١٨)ی مانگی (ذی‌العقدة)ی ساڵی ١٣٤٦دا کاتێک کەقایمقامی قەرەداغ دەبێ ئینگلیزەکان دەیگرن‌و بۆ ناسریەی دووردەخەنەوەو دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان. شێخ عەبدولقادر لەساڵی ١٣٥٤ی کۆچی لەناوایی سەنگاو کۆچی دوایی دەکات.

١١-شێخ حسێنی شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان لەبەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا سەبارەت بەهەوڵو کۆششی دواین.

١٢- لەم بارەیەوە زانای مێژوونووس دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێ (جەنگاوەرەکانی مەحمودخانی دزلی بەشێکی زۆری سوپاکەی شێخ مەحمودیان پێک هینابوو)، بۆ ئەمەیش بروانە:

الدکتور کمال مظهر احمد، دور الشعب الکردي في ثورة العشرین، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٨، ص١٤٢.

١٣-عەبدوڵلابەگی دزلی کورەگەورەی مەحمودخانی دزلیە کەلەگەڵ باوکیدا فەرماندەی دەستەیەک لەشۆرشگێرەکانی گرتبووە ئەستۆ، ساڵانێکی زۆر لەزیندانەکانی (رەزاشا)دا بووەو ماوەی (٧) ساڵ لەزیندانی (تاریک)دا ژیانی بەسەر بردووە، ساڵی ١٩٤١ لەشکاندنی بەندیخانەی (قەسری قاجار)دا ئازادکراوە، ساڵی ١٩٨٧ لەئاوایی دزلی کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێ نێژراوەو ئەوەکانی لەئاوایی دزلی نیشتەجێن.

١٤-بۆ ئەم سێ بەیاننامەیە بروانە: ئەحمەد خواجا، چیم دی، چاپخانەی شەفیق، بەغداد، ١٩٦٨، ل٤٦،٤٧، بەرگی یەکەم.

١٥-دبلیو ئارهی، سنتان فی کوردستان، ١٩١٨-١٩٢٠، ترجمە فؤاد جمیل، بغداد، ١٩٧٢، الجزء الاول،ص١٩٢.

## بەشی شەشەم

# ڕۆژە ئاڵۆزەکانی دوای دەربەندی بازیان

دوای شکست و پەرەوازە بوون و باری ناهەمواری شۆڕشگێڕانی کوردو جەماوەری ناوچەکانی کوردەواری لە ئەنجامی جەنگی نابەرانبەری (دەربەندی بازیان) و بریندارکردن و بەدیلگرتن و ڕەوانەکردنی شێخی نەمر بۆ بەغداد ودادگاییکردنی لە ڕۆژی ١٩١٩/٦/٢٥ داو دواتر دەرکردنی فەرمانی خنکاندن بەسەر حوکمداری کوردستاندا لە ڕۆژی ١٩١٩/٧/٢٥ داو گۆڕینی بە دەساڵ بەندیو ڕەوانەکردنی بۆ هیندستان. لە لایەکی ترەوە لە ڕۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ١٩١٩ دا شاری سلێمانی کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکان و (بەرانبەر بە ماڵی حوکمدارو چیای گۆیژە ریزە تۆپیان دابەست و سەرگردی قشڵەیان کرد بە بارەگای جەنگی) و ڕۆژی ١٩١٩/٨/١٨ مێجەر (سۆن) هاتەوە سلێمانی و دەسەڵاتی گرتەوە دەست و تا ڕۆژی ١٩٢١/٢/٥ مایەوەو دوای خۆیشی مێجەر (گۆلد سمث) هاتە شوێنی. (مەحمود خانی دزڵی) ش دوای شکستی دەربەندی بازیان بەخۆیو جەنگاوەرەکانی یەوە باشووری کوردستانی بەجێهێشت و ڕوویکردەوە شوێنە سەختەکانی ناوچەی دزڵیو هەورامانی تەخت.

دیاره ئینگلیزەکان لە رزگارکردنی شاری سلێمانیو رۆژانی دواتردا (خانی دزلی) یان باش دەناسیو لەوە ئاگاداربوون کە جەنگاوەرەکانی لە شاری سلێمانیدا سوپای ئینگلیزیان لە پەلوپۆ خستبوو، بەم جۆرە بە دوژمنێکی سەرسەختی خۆیان دەزانیو دەیانویست بەیدەستی بکەن، بۆیە دەست بەجێ کاربەدەستانی ئینگلیز بە داوایەکی رەسمی فەرمانڕەوایانی ئێرانیان ناچارکرد کە (مەحمود خانی دزلیو مەحمود خانی کانیسانان)[1] بگرنو بەجووتە بدرێنە دەست دەسەڵاتدارانی ئینگلیز، کاربەدەستانی ئێرانیش بە فێڵ داوی پلانێکیان بۆ چنینو هەردووکیان گرتنو نێرران بۆ بەندیخانەی (ئیچ قەڵا) لە بەغدادو لەوێشەوە (مەحمود خانی دزلی) نێررا بۆ هیندستان تا لەگەڵ شێخی نەمردا بەند بکرێنو لە کوردستان دووربخرێنەوەو لەو ماوەیەدا دووچاری سزاو ئەشکەنجە هاتنو (مەحمود خانی کانیسانان) یش ماوەیەك بە دەست بەسەری لە بەغداد هێلرایەوە[2]...

لەو رۆژگارە نەهامەتیو جەنجاڵەدا کە شێخی نەمری بەردەقارەمانو مەحمود خانی دزلی خزێنرانە کونجی تاریکی زیندانەوەو دەست بەسەرکردنی مەحمود خانی کانی سانان لە بەغداد و کردەوە ناچیزەکانی مێجەر (سۆن) لە سلێمانی، ئەم رووداوانە سەرجەم بوونە مایەی خەمو پەژارەو پەلاماردانو نارەزاییدەربڕینو تەنانەت فرمێسك رشتن، شاعیری بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردو پشتیوانی شێخی نەمر (ئەحمەد بەگی ساحیب قران -حەمدی ١٨٧٨-١٩٣٦/١١/١٢) لەو رۆژانەدا دەنگی کسپەو ناسۆری خۆیو نەتەوەکەی دەربڕی:

شەرتە تا رۆژی قیامەت دەست لە ئەژنۆ بەرنەدەم
سەر لە قوڕنێم بۆ سیادەت بەم دڵەی غەمناکەوە

بــۆ دلــێری حــەزرەتی مــەحمود مــەمدوحی جیــهان
تاقــە یــەك گــوڵ بــوو بــە فــەرقی پــیری ئەحمــەد کاکــەوە
بۆ (دوو مــەحمود خــان) ئــەمیری ســەرحەدی رۆم و عەجــەم
بوونــە ئەســحابی قورەیش‌وچوونــە ســلکی چاکــەوە [٣]

لە لایەکی ترەوە روناکبیرو نیشتمان‌پەروەرەکانی ئەو سەردەمەو تیرەو ئێڵە کوردەکان و توێژەکانی تری کۆمەڵی کوردەواری بە بێ دەنگی و خامۆشی نەمانەوە، جارێ بە ئاژاوەو پەلاماردانی دەستگاکانی ئینگلیز، هەندێ جار بە نارەزایی دەبرین، زۆر جاریش بە نووسین و دەرکردنی بەیاننامەو پێکهێنانی رێکخراوی نهێنی وەك هێزێکی وروژاندن و هەژان و ورباکردنەوە، تەنانەت لە مانگی مارتی ١٩٢٠ دا کۆمەڵەی فیداکاران ئەم نامەیانە نووسی و ناردیان بۆ مێجەر (سۆن):

*(بە زوویی دەبی حوکمدارو ئەو دیلانەی تری دەربەندی بازیان کە ئێستە لە -ئیچ قەڵا- خشتیان پی‌دەبڕن بی‌یان هێننەوەو باش بیر لە دوا رۆژی خۆتان بکەنەوەو ئەوی قەومێك بە دیل بزانێت بە دیل دەگیرێت)* [٤].

لە ناوچەی هەورامان و دەروپشتی هەڵەبجەیش ئەوانەی سەر بە مەحمود خانی دزلی بوون دەستگاو سوپای داگیرکاریان هەراسان کردبوو، هەر لەو رۆژانەدا پەلاماری ماڵی (عادلە خانم) [*]ی جافیان دا کە سەر بە ئینگلیزەکان بوو [٦]، لێپرسراوانی ئینگلیزیش لە تۆڵەی ئەم کارەدا گوندەکانی (بارام ئاوا) و (بەڵخە) وچەند گوندێکی تری هەورامانیان بوردومان کرد [٧]. لەو کاتەدا رۆژنامەی (پێشکەوتن) ی دەستی مێجەر (سۆن) هێرشێکی توندی بردە سەر دانیشتوانی دزلی و هەورامان و چەندین ناو و ناتۆرەی ناشیرینی پێدالکاندن [٨].

له ناوچەی -کفری- ش (هۆزی دەلۆو بەشێك له جافەکان بە سەرکردایەتی برایم خان‌و وەیس بەگ رۆژی ٢٤ی ئاب دوای شەرێکی کەم -کفری- یان ئازاد کردوو هەموو ئەو هێزانەی دوژمن کە لەوێ بوون بە دیلیان گرتن‌و کاپتن- سالمۆن- یان بردو ئالای بەریتانیایان داگرت)[٩] ولەم لایشەوە (ئینگلیزەکان مەترسی ئەوەیان لێ نیشت،گری شۆرش شوێنەکانی تری کوردستان بگرێتەوە، هەر زوو هێزێکی گەورەیان بە سەرکردایەتی ئەفسەری سیاسی کەرکوك - لۆنگریك- ناردە کفری، بەشێك لە زەنگەنەو تالەبانی‌یەکان دایانە پاڵ ئەم هێزە.

سەرەتا - لۆنگریك - هەولێدا لە رێگەی گفتوگۆوە سەردارانی راپەرینەکەی کفری قایل بکات‌و خۆ بەدەستەوە بدەن، بەلام ئەوە دادی نەدا چونکە شۆرشگێرانی ناوچەکە سووربوون لە سەر بەرگری، ئەوساکە هێرشی ئینگلیز دەستی پێکردو شۆرشگیران ناچاربوون بکشێنەوەناوچە سەختەکانی دەوروبەری شار، کە لەوێوە بە کوشتنی کوری سەرداریکی کوردیان زانی لە وەلامدا کاپتن سالمۆن یان کوشت کە تا ئەو کاتە وەك بارمتە گلیان دابۆوە، کوشتنی -سالمۆن- لۆنگریکی تەواو شێتگیر کردو ئەویش لە وەلامدا ١٠ هەزار روپیەو ٥٠٠ تفەنگ سزای خستە سەر دانیشتوانی کفری)[١٠]. و رۆژنامەی (پێشکەوتن) ی ئەو سەردەمە سەبارەت بە چەکێکی رووداوەکان‌و بارودۆخی ناوچەکە زانیاری بلاوکردووەتەوە[١١].

لەم لایشەوە سالی ١٩٢٠ (شێخ فەرەجی بانی‌بنۆك) بە خۆیی‌و خزم‌و کەس‌وکارو لایەنگرانی‌یەوە رێگای سلێمانی‌و هەلەبجەیان بری‌و لەگەل ئینگلیزەکاندا کەوتنە شەرەوەو فرۆکەکانی داگیرکار سەنگەری شۆرشگێرەکانیان بوردومانکرد.[١٢]

له هاوینی سالّی ۱۹۲۰ دا کۆبوونەوەیەك لە گوندی (ژاڵە) ی لای کرپچنە سازکرا، کەریمی فەتاح بەگو سەید محەمەدی جەباری‌و شێخ مستەفای شێخ قادری گولله نەبڕو ئاغاکانی زەنگەنە-عەبدولکەریم وادی ئاغا و عەزیزی جاسم ئاغاو رۆستەم ئاغا- تێیدا بەشداربوون‌و بڕیاریاندا بۆ گەڕانەوەی‌شێخ مەحموود لە هیندستان دژی ئینگلیزەکان بجەنگن.[١٣]

لە مانگی ئابی ۱۹۲۱ دا هێزەکانی عەشایەر لە ناوچەی پشدەر پەلاماری سوپای ئینگلیزیان دا لە رانیەو فڕۆکەکانی دوژمن جەنگاوەرانی بوردوومان کرد.[١٤]

لە ناوچەی چەمچەماڵو دەوروبەری‌دا (مەحمود خدری هەمەوەندو کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕی‌و سەید محەمەدی جەباری) هەر یەك لە لایەکەوە سوپاو دارو دەستەی داگیرکارانیان پەریشان کردبوو، جگە لە مافەکانی کورد داوای هێنانەوەی شێخی نەمریان دەکرد.[١٥]

لە دەوروبەری سالی ۱۹۲۱ دا مەحمود خانی دزلّی لە بەندیخانەو ئاوارەیی هیندستان ئازادکراو گەڕایەوە هەوارو نیشتمانی خۆی، دیارە بەلای لێپرسراوانی ئینگلیزەوە بە ئازادکردنی ئەم گەورە پیاوە رەنگە ئاژاوەو راپەرین‌و ئالۆزی لە ناوچەکەدا نەمێنێ‌و گیانی بەرهەڵستکاری‌و بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانە بنەبڕ ببێ، بەلام بە پێچەوانەوە، چونکە بە گەیشتنەوەی خانی دزلّی سەر لەنوێ گڕی قین‌و کاری شۆڕشگێڕانە لە ناوچەی هەورامان‌و دەوروپشتی تەشەنەی سەندو زیاتر گەشایەوە، دوژمنی دێرینی کورد (ئەدمۆندز)[١٦] لەم بارەیەوە دەڵێ: (سالی ۱۹۲۲ کە بە ئیجازە گەڕامەوە کرام بە یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە، کە ئەمە وەزیفەیەکی ئێجگار بچووك بوو لە چاو ئەوەی پێنج سال لەمەوپێشم، بەلام ئاگادارکرام کە هەڵوێست لە ناوچەی سلیمانی‌دا تەواو ئالۆزەو هەڵەبجەیش پێویستی بە یەکێکی زۆر

شارەزا هەیە، کەچوومە هەڵەبجە عەشایەری هەورامان بە سەرۆکایەتی- مەحمود خانی دزڵی- دژی ئێمە هەستابوون، مەحموود خان لە کاتی خۆیدا لەلایەن حوکومەتی ئێرانەوە تەسلیم بە ئێمە کرابوو، بەڵام ئێمە هەڵەیەکی گەورەمان کرد کە بەرەڵلامان کردو گەڕایەوە شوێنی خۆی چونکە لەوێوە دەستی کرد بە پەیوەندیکردن بە تورکەکانەوە.) [١٧].

بەم جۆرە خانی دزڵی لە جاران فراوانتر پەلی بۆ ناوچەکان هاویشتو گڕی خەباتی بڵێسەی سەندو ئەم شەڕو ئاڵۆزبوونەی ناوچەی سلێمانی بە گشتیو دەوروبەری هەڵەبجەو هەورامان بەتایبەتی لە چەند (دۆکیومێنت)ێکی ئارشیفی وەزارەتیدەرەوەی بەریتانیاو وەزارەتی فرۆکەوانیو شوێنەکانی تر پارێزراونو ئێمەیش لێرەدا پەنجە بۆ چەکێکی رادەکیشینو تیشکی پێویستیان دەخەینە سەر کە سەرڕێژن لە زانیاریو وردەکارییەکانی ئەو رۆژگارە جەنجاڵەی مێژووی خەباتی کورد.

١- دۆکیومێنتی ژ(H.C.36-C.O.730-19)ی رۆژی ١٩٢٢/١/١٤ لە مەندوبی سامی بەریتانیاوە لە بەغداد بۆ وەزارەتی موستەعمەرات:

(دوا بە دوای تیلیگرافی ژ ٨٤١ی رۆژی ١٩٢١/١٢/٣٠ سوارە چەکدارەکانمان لە رۆژی ١٩٢٢/١/١٣ دا لە نزیکی هەڵەبجە تووشی شکاندنێکی خراپ بوون کە لە ناوچەی خورماڵدا روویداو کە بە داخەوە ئەم هەواڵە ناخۆشەتان دەدەمێ، H.C.O. Fitz gibbon لەگەڵ ٢٠ کەسدا کوژراونو لاشەکانیان دیارنییە، فرۆکەکانمان ئەو ناوچانە بەجێناهێڵنو دەچنە سلێمانیو بە سەر شارەزووردا دەفڕن، هەڵوێست هەتا بڵێی ئاڵۆزو ناخۆشەو هەواڵی شەڕەکەم بە تەواوی پێنەگەیشتووە، بەڵام شکاندنمان لەم شەڕەدا بەهۆی مەحموود خانی دزڵییەوە بووە کە ئاگاداری ئەوەم هەتا ئێستا بە چەند نامەیەك پەیوەندی بە مستەفا کەمال- ەوە کردووە) [١٨].

٢- دۆکیومێنتـــــی ژ C.O.730-14 ی ڕۆژی ١٩٢٢/١/١٥ برگـــــەی ٣٦ی ڕاپۆرتێکی نهێنی‌یەو دەڵێ: (لە سنووری هەورامان دا مەحموود خانی دزڵـی لەگەڵ چەند چەکدارێك ڕوویان کردە ناوچـەی سـرۆچك-بەرزنجـە- و لـە ١٩٢١/١٢/٢٧ دا خۆپیشاندانێکی هێزی ئاسمانی کرا بۆ سەر سلێمانی، لـە ئەنجامی ئەوەدا ئەوانەی چووبوونە سرۆچك گەڕانەوە سنووری ئەودیو بـۆ هەورامان.) [١٩].

٣- دۆکیومێنتـی ژC.O.730-19 کە بریتی‌یە لە ڕاپۆرتێـك سەبارەت بە ڕووداوەکانی ١٩٢٢/١/١هەروەها ١٩٢٢/٢/١، لە برگەی (٩٤) ی ئەو ڕاپۆرتـەدا دەڵێ:

(هەڵوێست لە سلێمانی جێگەی دلنیـایی نی‌یەو پروپاگەندەی تـورك زۆر بەهێزەو لەناو خەڵکدا بڵاو بووەتەوە کە ئینگلیزەکان خەریکن بکشێنە دواوەو ناوچەکە بەجێ‌بهێڵن، وەکیلـی تورکـەکان لـەناویاندا بـڵاوی دەکاتـەوە کـە بەربەخۆیی کورد لە لایەن ئینگلیزەوە جی‌بەجێ ناکرێو تورکە کەماڵی‌یەکان ئامادەن یارمـەتی مـەحموود خـانی دزڵـی بـدەن، لـە ناوچـەکانی هـەورامانو مەریوان پروپاگەندەی تورك کاری زۆر کردووەتە سەر خەڵك و لەلایەن H.B.M کە قونسوڵی بەریتانیایە لە کرماشان هەواڵ گەیشتووە کە پروپاگـەندەی تورك کاری کردووەتە سەر خەڵكو بۆلشەفیکیش کەمێك ئەو پروپاگەندانەیان بە ناو خەڵکدا بڵاوکردووەتەوە..

لە مانگی دیسەمبەری ١٩٢١ بە دواوە خەریکن لە ناوچەی خورماڵ باجو سەرانە کۆدەکەنەوەو هەواڵ وادەگەیەنێت کە (مەحمود خان) خـۆی یەکێکـە لەوانەی کە سەرپەرشتی باج کۆکردنەوە دەکات، بەڵام ساتێك فڕۆکەکانمان لە ١٩ی دیسەمبەری ١٩٢١ دا بە سەر ئەو ناوچانـەدا فڕیـن هـەموو ڕایان کـردە ناوچە شاخاوی‌یەکان، مەحموود خانی دزڵی چووەتە (باخە کۆن) کە دوو میل

له هه‌ڵه‌بجه‌وه دوورمو له‌وێوه نامه‌ی ناردووه بۆ ئه‌فسه‌ری سیاسی ئیمه له هه‌ڵه‌بجه که ده‌یه‌وێ ئیخلاسی خۆی ده‌رببڕێ بۆ حوکومه‌تی به‌ریتانیا،به‌ڵام ئه‌م نامه‌یه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی بۆ (سمکۆ) و (مسته‌فا که‌مال)ی ناردووه پێچه‌وانه‌ی یه‌کترن، جگه له‌وه‌یش نامه‌یه‌کی ناردووه بۆ عه‌شیره‌ته‌کانی (هه‌مه‌وه‌ند) و له‌و نامه‌یه‌دا گاڵته‌ی به‌وانه کردبوو که دان به ده‌سه‌ڵاتی ئینگلیزدا ده‌نێن‌و سه‌ری بۆ داده‌نه‌وێنن.

هه‌روه‌ها له برگه‌ی (٩٥) ی هه‌مان راپۆرت دا ده‌ڵێ:

(ئه‌حمه‌د به‌گی ڕیشێن) له سلێمانی رای‌کرد، ئه‌م پیاوه ده‌سه‌ڵاتدار نی‌یه، به‌ڵام کچی _عادله خانم-ی هێناوه‌و سکرتیری -عادله خانم- بووه، ئه‌حمه‌د به‌گ له کاتی خۆیدا به ده‌ست به سه‌ری نێرابوو بۆ سلێمانی چونکه په‌یوه‌ندی به مه‌حمود خانی دزلێ‌یه‌وه هه‌بوو، له به‌ر ئه‌وه له سلێمانی خرابوه ژێر چاودێری‌یه‌وه، به‌ڵام له سلێمانی خۆی ده‌رباز کردو ده‌ڵێن له ئاوایی (رۆسته‌م به‌گ) خۆی شاردووه‌ته‌وه که له پێده‌شتی شاخی هه‌ورامان‌دایه، ئینجا بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌حمه‌د به‌گ نه‌گاته لای مه‌حموود خان ٧٠ سواری لیڤی به سه‌رکردایه‌تی کاپتن (فیتز گیبون fitz Gibbon) له‌گه‌ڵ ئه‌فسه‌رێکی خه‌ڵکی ناوچه‌که نێرران بۆ هه‌ڵه‌بجه، له ١٩٢٢/١/١١ دا بڕیاردرا به‌نهێنی بچنه سه‌ر ئاوایی-رۆسته‌م به‌گ-و له‌کاتێکدا که‌ئه‌و هێزه له ١٩٢٢/١/١٢ گه‌یشته ئاوایی‌یه‌که ده‌رکه‌وت که دوو گوند به‌و ناوه‌وه هه‌یه که یه‌که‌میان گیرا ئه‌حمه‌د به‌گ له‌وه‌یاندا نه‌بوو، به‌ڵام هێزی لیڤی زیانێکی زۆری لێکه‌وت‌و کاپتن Fitz Gibbon به گولله‌یه‌ك کوژرا له‌گه‌ڵ (١١) سه‌ربازی لیڤی‌و مه‌یته‌ره‌که‌ی ئه‌فسه‌ری سیاسیش کوژرا، مه‌حموود خانی دزلی که ئاگاداری ئه‌و شه‌ڕه بوو یه‌کێك له کوره‌کانی‌و (٢٥٠) چه‌کداری له دزلی‌یه‌وه گه‌یانده ئه‌و ناوچه‌یه‌و هه‌ورامی‌یه‌کانیش چوونه پاڵ ئه‌و، به‌ڵام به‌هۆی بۆردومانی فرۆکه‌وه هێزه‌که‌ی

مـەحموود خـان کشـایەوە دواوەو ئەحمـەد بـەگی ریشـێن خـۆی گـەیاندە لای مەحموودخان.[20]

٤-دۆکیومێنتی ژ C.O.730-19 ی رۆژی ١٩٢٢/٢/٩ بریتی‌یە لە نامەیـەکی مەندوبی سامی بەریتانی لە بەغداد کە بۆ وەزیـری موستەعمەراتی ناردووەو دەڵێ:

(هەڵوێست هـەتا بی ئالۆز دەبێ، تاقە رێگەیـەك بۆ چارەسـەرکردن دەسـت بدات ئەوەیە هەوڵبدرێ دۆستایەتی لەگەڵ تورکەکاندا پەیدا بکرێ، هەڵوێست لـە ناوچـە کوردی‌یـەکانی مووسـڵو هـەولێرو سـلێمانی‌دا زۆر ئـاڵۆزەو پـڕ لـە مەترسی‌یە، کشانەوەمان پڕە لە مەترسی بە تایبەتی ئەگەر دانیشتوان بۆیان دەرکەوت ئێمە هێزەکانمان دەکێشینەوە، پروپاگەندەی تورکەکان لە ناو کوردە نەتەوەیی‌یەکانی سلێمانی‌دا زۆر بە هێزو کاریگەرە، مەحموود خانی دزلێ بە هاندانی تورکەکان لە ناوچەی هەڵەبجەو خورماڵدا لە بزوتنەوەدایەو پەیوەندی لەگەڵ مستەفا کەمالدا هەیەو لەوەیش ترسناکتر ئەوەیە کوردەکان هەوڵی ئەوە دەدەن مافو داخوازی‌یەکانیان لە رێگەی تورکەوە دەستگیر بێت کە نابێ ئەم تەقەللایە پشت گوێ بخرێ.[21]

دکتـۆر کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد سـاڵی ١٩٨٤ راپۆرتێکـی ئینگلیزەکـانی بڵاوکردەوە کە داویانە بە کۆمەڵەی گەلانو دەربارەی کاروباری بەڕێوەبردنی عیراقە لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٠ تاکوو مانگی مارتی سالی ١٩٢٢، لەو راپۆرتەدا (ناوی شێخ مەحموودو سمایل ئاغای شوکاك-سمکۆ-و مـەحموود خانی دزڵی‌و ئەورەحمان ئاغای سەرۆکی هۆزی شرناخی باکووری کوردستانو ژمارەیەك ناوداری تری کورد هاتووە، دەربارەی شێخ مـەحموودو مـەحموود خـانی دزلـی گـەورەی هـەورامان دەڵێ: لـە ناوچـەی سلێمانی پروپاگەندەیـەکی زۆر دژی‌بەریتانیا کراوە، سالی ١٩١٩ مەحموود خـانی سـەردلری گوندی دزلێ

بەشداری بزووتنەوەکانی شێخ مەحموودی کردو ساڵی ١٩٢٠ لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە دیل کراو درایە دەست کاربەدەستانی‌بەریتانیا، دوای ئەوەی لە هیندستان ماوەیەك بە بەندی مایەوە، لەئەیلولی سالی ١٩٢١ رێگەی درایە بگەڕێتەوە سلێمانی بەو مەرجەی وەك بەڵێنی‌دا نەچێتەوە دیوی ئێران بەڵام مەحموود خان بەڵێنەکەی شکاندو گەڕایەوە دزڵی‌و لەوێوە نامەی بۆ مستەفا کەمال ناردو داوای چەکی لێ کرد بۆ دەرکردنی ئینگلیز لە ناوچەی سلێمانی، کانوونی یەکەم ژمارەیەك وردە سەرداری هەورامان کە بێگومان پەیوەندی‌یان پێوە هەبوو هاتنە دەشتی هەڵەبجەو کەوتنە کۆکردنەوەی باج،ناوەندی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ هێزێکی لیڤی کەوتە ناو بۆسەیەکەوە ژمارەیەکیان پێکران کە یەکێکیان ئەفسەری بەریتانی کاپتن فیتز گیبوونی فەرماندەی هێزەکە بوو، دوای ئەوە لە بریتی پیادە بە فڕۆکە هێرش کرایە سەر هەڵەبجەو ئەنجامی ئەو هێرشە زۆر سەرکەوتووبوو، مەحموود خان بە ناچاری گەڕایەوە گوندی دزڵی، بەڵام پیاوەکانی لە پەلاماردانی دەشتی هەڵەبجە نەکەوتن، مانگی مارت فشاری فڕۆکە مەحموود خانی ناچارکرد پەیوەندی بە کاربەدەستانی ئینگلیزەوە بکات) [٢٢]

ئینگلیزەکان هەستیان کرد کە ناوچەکانی کوردستان بە گشتی‌و ناوچەی هەورامان بە تایبەتی بەرەو ئالۆزی‌و پشێوی دەچێ‌و هەر ساتە لە لایەکەوە پەلامار دەدرێن بۆیە (بڕیاریان‌دا کە پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ مەحموود خانی دزڵی‌دا مۆر بکەن‌و ئەویش دەستبەجێ جەنگاوەرەکانی لە ناوچەکان‌دا بکشێنێتەوە، لە مایسی ١٩٢٢دا پەیمانەکە پێکهێنرا، بەڵام هەندێك لە جەنگاوەرەکان نەگەڕانەوەو زنجیرەیەك بزوتنەوە لە ناوچەی هەورامان‌دا روویان داو لە زۆر لاوە کەسانی تریشیان پێوەلکا، بۆ بەربەست کردنی ئەم هێرش‌و

پەلاماردانــە ئینگلیزەکـــان هـــێزی ئاسمانیـــان بـــەکارهێناو ســـەنگەری شۆڕشگێڕانیان لە -بانی بنۆك- بوردوومان کرد)[٢٣]

کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندیش لە رۆژی ١٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢دا بەونیازەی لە دەوروبەری ئاوایی -مۆرتکەی_ ناوچەی بازیاندا لەگەڵ کاپتن -بۆند-ی لێپرسراوی ئەو سەردەمەی چەمچەماڵ کۆببێتەوە[٢٤]، لە کاتی وتوویژدا کەریم بەگ قسەو هەرەشەکانی -بۆند- ی پێقبوڵ ناکرێو هەر لەویدا کاپتن (بۆند) و (ماکانت)ی یاوەری دەکوژێو سەر لەنوێ بێ ئارامی دەکەوێتەوە ناوچەکەو کۆلۆنیل Mientی ئەفسەری هێزی لیڤی روودەکاتە (تەینال)و لاشەکان دێنێتەوە، کەریم بەگ ماوەیەك لە ناوچەکانی چەمچەماڵو قەرەداغ و سەنگاودا دەمێنێتەوەو سوپاو هێزی ئاسمانی ئینگلیزەکان هەنگاو بە هەنگاو سۆراخی دەکەن، رۆژی ٢٢ی تەمموزی ١٩٢٢ لە نزیك دوکانەوە لە ئاوی زێ دەپەڕێتەوەو خۆی دەگەیەنێتە لای (ئۆزدەمیر)[٢٥] لە رەواندوزو رۆژی ٢٣ی ئابی ئەو ساڵە بەشداری شەڕی دەربەندی رانیەی کردووەو شێرانە جەنگاوە. (گۆلد سمث) ی حاکمی سیاسی ئەو سەردەمە لە رۆژنامەی (پێشکەوتن) دا [٢٦] ئەم هەواڵەی بلاوکردۆتەوە:

*(شەخسێك وەیا چەند شەخسێك ئەگەر خەبەرو ئیطلاع بدەن و ئەو خەبەرو ئیطلاعە ببێ بە سەبەبی تەوقیف و گرتنی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند لە لایەن حوکومەتەوە دە هەزار روپیە ئەنعامو بەخششی دەدرێتێ، دیسان ئیطلاع بدرێت و ببێ بە سەبەبی گرتنی سەید محەمەدی جەباری بۆ ئەمەیش دوو هەزار روپیە ئەنعامو بەخشش دەدرێت).*

ئیمزا

گوڵد سمث

حاکمی سیاسی

جموو جوڵەکانی کەریم بەگی هەمەوەند لە ڕۆژگاری ئاوارەیی شێخی نەمردا کەسایەتی یەکی ناسراوی مێژوویی وەك (وینستۆن چەرچڵ) ی وەزیری موستەعمەراتی ئەو سەردەمەی بەریتانیای مەزنی هێناوەتە قسە:

*(لەندەن- ٥ی تەمموز. میستەر چەرچڵ جوابی ئەو پرسیارەی دایەوە کە لە مەجلیسی عمومی بەریتانیا لێیان کردو وتی: مەعلوماتێکی تری مست نەکەوتووە لە لایەن -کاپتن بۆند- و کاپتن -ماکانت- ەوە کە کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند کوشتوونی، بەڵام لەم ڕووەوە لەگەڵ مەندوبی سامی عیراقدا موخابەرە هەیە، عەسکەری لیڤی کە قوماندانیان زابتانی بەریتانیایە موعاوەنەتی قووەی هەوایی دەکەن بۆ نازڵکردنی عیقاب بە سەر جورمدارەکاندا)*[٢٧]

جگە لەمانەیش لە ڕۆژی ١٩٢٢/٧/٥ دا (سیر پیرسی کۆکس) ی مەندوبی سامی لە بەغداد تیلیگرافیکی ناردووە بۆ ئەستەموڵ و هیندستان و میسرو دەڵێ:

(ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك لەگەڵ ئەو هەموو هەرەشەو فشارەی کەهێزی لیڤی خستی یە سەر پیاوکوژەکانی کەریمی فەتاح بەگ و تاقمەکەی، ئەو گوندانەی کە یارمەتی یان دابوو هەموو سزادران و هێزی ئاسمانی دەوری خۆی بینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کەریم بەگ پەلاماری هێزێکی بچووکی لیڤی دا لە سەر ڕێگەی کفری-کەرکوك کە لەو شەڕەدا چوار لیڤی کوژراو هیچ دەسەڵاتدارو ئاغایەك لەو ناوچەیەدا نەبووەتە لایەنگری کەریم بەگ، ئەو هێزی تۆپخانەیەی سێك کە لە موسڵەوە نێرراون لە ١٩ی تەممووزدا دەگەنە کەرکوك)[٢٨].

وەك وتمان لە سەرانسەری باشووری کوردستان و دەوروبەریدا بەرهەڵستکاری و ڕازی نەبوون بەرانبەر ئینگلیزی داگیرکارو داواکردنی

هێنانەوەی شێخی نەمر گەیشتبووە لوتکە، دۆکیومێنتی C.O.730-23ژ ی ڕۆژی ١٩٢٢/٧/٦ نامەیەکی مەندوبی سامی (سیر پێرسی کۆکس)ە بۆ کاربەدەستانی خۆی لە لەندەن و دەڵێ:

(داوای سەربەخۆیی بۆ کورد لە باشووری کوردستاندا لە پەرەسەندندایەو کە بێگومان سەرکەوتنەکانی سمکۆ لە ئێراندا ئەو هەستەی بەتین تر کردووەو بۆ ئەم مەبەستە داوای بوونی سەرکردەیەکی کورد دەکەن و بە هیچ جۆرێکیش نایانەوێ بخرێنە سەر عیراق)[٢٩]

هەروەها لە برگەی ٤٩٧ی ئەو ڕاپۆرتەدا دەڵێ:

(ئەوانەی لە ناوچەی پشدەر دژی بابەکری سەلیم ئاغان ئیمزایان کۆکردووەتەوەو داوای هێنانەوەی شێخ مەحموود دەکەن بۆ کوردستان، جگە لەوانە هەندێ کەسی تریش هەر ئەو داخوازییانەیان هەیە کە بریتین لە شێخ و مریدەکانی ناوچەی سلێمانی)[٣٠]

هەروەها دەڵێ:

(لە ناو خەڵکدا بڵاوبووەتەوە کە لێبوردنێکی تازە بە دەستەوەیە لە دوای ئەم پشێوی و ئاژاوانەی کە روویان داوە، دەنگ وایە شێخ مەحموود دەهێنرێتەوە، مەحموودخانی دزلی و دەسەڵاتدارانی وێنەو جافەرسان داوای هێنانەوەی شێخ مەحموود دەکەن)[٣١]

### هاتنەوەی شێخ مەحموود بۆ کوردستان:

گەر سەیری نەخشەی سیاسی ئەو رۆژگارە بکەین کە شێخی نەمر ماوەیەکی ژیانی بە ئاوارەیی بەسەر بردووە دەبینین کە رستێك رووداوی سیاسی کاریگەر لە ناوچەکەدا هاتونەتە پێشەوەو ئینگلیزەکانیش لە بەرتیشکی ئەو گۆڕانکاری و رووداوانەدا بیریان لە چارەسەرێك کردەوە تا بەوهۆیەوە هەندێ گرفت و ئاڵۆزی کەم بکرێتەوەو تا رادەیەکیش پشوویەك

بدەن، ئیمەیش دەتوانین بە کورتیو بە نووکە قەڵەمێکی درشت هەندێ لەو ڕووداوانە بخەینە بەرچاو کە کەوتوونەتە ماوەی پێش هاتنەوەی شێخی نەمر:-

١-لە ڕۆژی ١٩٢٠/٨/١٠ دا هاوپەیمانەکان توانیان پەیمانی (سیڤەر) بە سەر تورکەکاندا بسەپێنن، ئەو پەیمانەی کە ماددەکانی ٦٤،٦٣،٦٢ی پەیوەندییەکی توندوتۆڵو شەتەکدراویان بە چارەنووسی کوردەوە هەبوو، بەتایبەتی مادەی ٦٤ کە سەبارەت بە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆیە بۆ کوردەکانی باکووری کوردستان و ڕێدان بە کوردەکانی باشوور کە لە ئایندەدا بچنە ناو ئەم دەوڵەتەوە.

٢-لە مانگی مایسی ١٩٢١دا کۆنگرەی قاهیرە بە چاودێری (چەرچڵ) بەسترا کە ئەو کاتە وەزیری موستەعمەرات بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە کۆنگرەی قاهیرە لەزۆر بابەتی سەرەکی کۆڵییەوە کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو، بەڵام گۆرانگارییەکی ئەوتۆ لە سیاسەتی ئینگلیزەکاندا دەرنەکەوت بەرانبەر بە کورد، (لەو ڕاپۆرتەدا کە ئینگلیزەکان دەربارەی کاروباری بەڕێوەبردنی عیراق لە مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٢٠دا تاکوو ئابی ١٩٢٢)[٣٢] ئامادەیان کردووە باسی کۆنگرەی قاهیرەو سیاسەتی ئینگلیز بەرانبەر بە کورد کراوە، هەر لەو ڕاپۆرتەدا لەوەیش دواون کە کوردەکانی باشوور بە تایبەتی ناوچەی سلێمانی بەشدارییان لە دانپیانانی فەیسەڵی یەکەمدا نەکردووەو لە ١٩٢١/١٠/٢٥ یشدا حوکومەتێکی کاتیبەچاودێری ئینگلیز لەعیراق دا دامەزرینراو (عەبدولرەحمان نەقیب) کرا بە سەرەك وەزیران و (فەیسەڵ) یش کرا بە پاشای عیراق.

ساڵی ١٩٢١ ئینگلیزەکان لە هەوڵو کۆششێکی بەردەوامدا بوون کە باشووری کوردستان بلکێنن بە حوکمی عەرەبی عیراقەوە، بەڵام جەماوەری کورد دەنگی ناڕەزایی دەربڕی.

٣-له سەرەتای ئاوارەبوونی شێخی نەمرەوە بزووتنەوەو هەژان و نارەزایی سەرانسەری باشووری کوردستانی تەنی بۆوە، لە ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە شۆڕشگێرانی مەحموود خانی دزلّی هەر رۆژەی لەلایەکەوەزرمەیان لێ هەڵدەستان و بارگەو بنەیان دەکردن بە سووتوو، لە لایەکی ترەوە تورکەکان درێژەیان بە دوژمنایەتی و پڕوپاگەندەی خۆیان داو ئینگلیزەکانیان بێزار کردبوو، لە ئەنجامی تێکرا ئەم رووداوانەدا ئینگلیزەکان دوای رامان و بیرکردنەوەیەکی قووڵ و هەڵسەنگاندنی باروودۆخی ناوچەکە بیریان لە هێنانەوەی شێخی نەمر کردەوە بەلکو ببێتە هۆی کەم کردنەوەی گرفت و ئالۆزی‌یەکان، چونکە لەو باوەڕەدابوون کە کەسی تر ناتوانێ جیێ پڕبکاتەوە.

(رۆژی ١٩٢٢/١/١٣ لە بەندەری-بۆمبیی هیندستان-ەوە پاپۆڕی-بەنکورە-کەوتەرێ و شێخ مەحموودو شێخ حەمەغەریبی‌زاوای لەو پاپۆڕەدابوون و لە رۆژی ١٩٢٢/١/٢٨ گەیشتە کوێت) [٢٢]

بە گەیشتنی شێخی نەمر بۆ کوێت شادمانی کەوتە سەر لێوی جەماوەری کوردو شاعیرانی کوردپەروەری ئەو سەردەمە هەر یەکەیان چەپکە گوڵی شیعرو نوازشیان بۆ نارد، شێخ ماوەیەك لە کوێت مایەوە کە هەواڵی گەڕانەوەی گەیشتە کوردستان، رۆژنامەی- *بانگی کوردستان*- ئەم چەند دێڕەی سەبارەت بە هاتنەوەو جۆری پێشوازی بڵاوکردەوە:

*(لە وەقتێکدا جەنابی سەعد زەغلول پاشا کە لەسەر مەسئەلەی میللی‌یەت لە میسر گرتیان و بە حەپسی بردیان ئەهالی میسر عومومەن چوون بۆ ئیستیقبالی و بە سەرشان و سەر هەڵیان گرت بە ئەو نەوعە ئیحتیرامە داخلی شاربوو، حەزرەتی حوکمداری کوردستان جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی کە لە سەر عەینی مەسئەلە گیراو سێ ساڵ و نیوە حەپسە، ئێستا تەشریفی هێنانەوەی نزدیکە. بزانین میللەتی کورد بە چ نەوعێك ئیستیقبالی ئەکەن؟* و

*ئیحتیرامی ئەگرن؟ و لەحەق موشار ئیلەیهی بە چ حیس و حورمەتێك خۆیان نیشان ئەدەن)*[34]

لە لایەکی ترەوە رۆژنامەی بانگی کوردستان وەك بارانی پەڵە شیعری پێشوازی بە سەردا دەباری:

**روو بە قیبـــلە دەست بە سینە بۆ کویتێن چاوەڕێ**
**کـوردو گۆران هەر دەڵێن یا رەببی مەحموود بێتەوە** [35]

(حەمدی) شاعیری بزووتنەوەی نەتەوایەتی بە گەیشتنی شێخی نەمر بۆ کویت جوانترین تابلۆی شیعری نەخشاندوە:

**کـــــــەرۆیشتی بە جاری دڵو جەرگ و هەناوم کەوت**
**کە چویتە ( تانە ) تانە سەر گلێنەی هەردووچاوم کەوت**
**نـــــەڵێن هاتوویتە کوێت، بڵێ قوربانی کوێتی کەم**
**کـــە نۆبەت بەر سەری نەحسی شکاوی بێ کڵاوم کەوت( 36 )**

(بیخود) یش لە شیعرێکی ناوازەیدا خۆی دەکات بە قوربانیهەموو عەرەبستانی کویت چونکە تاجی سەری کوردی لێدانیشتووە:

**عومرێکـــە ســـیەه رۆژو پەریشـــانی کوومیتــــم**
**ئاشـــفتە وەکــوو طورەیـــی خوبـــانی کووەیتـــم**
**عومرێکـــە کـــەرۆژم بەمەســـەل وەك شـــەومزەنگە**
**حەســرەت زەدەیـــی شـــامی غـــەریبانی کوومیتـــم**
**عومرێکـــە لـــە زیندانـــی جنوونـــا کـــە وەکـــوو شـێت**
**پـــا بـــەندی غـــەزالانی ئەســـیرانی کووەیتــــم**
**عومرێکـــە لـــە کونجـی قەفەسـی فیرقـــەتی گوڵـــدا**
**وەك بولبـــولی دڵ خەســـتە غـــەزەلخوانی کوومیتـــم**

عومرێکه‌لـه‌ دووی مه‌حمه‌لی لـه‌یلا وه‌کـو مـه‌جنون
خـــۆم لــــێرمو دڵ وێڵی‌بیابــــانی کوومیتــــم
عومرێکـه‌ لـه‌ بـۆ کوشـتنی ده‌جـالی حه‌سـودان
هــه‌ر مونتـه‌زیری عیسـایی ده‌ورانــی کوومیتــم
عومرێکـه‌ ده‌نـاڵم بـه‌ غـه‌می تـۆوه‌ لـه‌ کـه‌رکوك
دایـم وه‌کـو نـه‌ی سینه‌ پـڕ نـه‌فغانی کوومیتـم
نیشم هـه‌موو هـه‌ر گریانـه‌ وه‌کـوو هـه‌وری بـه‌هاری
بـێ سـه‌رفی ده‌مـی غونچـه‌یی خـه‌ندانی کوومیتـم
پێویسـته‌ وه‌کـوو قومـری نـاواره‌ لـه‌ گوڵشـه‌ن
سـه‌ر گه‌شـته‌یی دڵ سـه‌روی خـه‌رامانی کوومیتـم
په‌روانـه‌ سیفه‌ت موضطـه‌ریبم کوللـی شـه‌و نـاخۆ
کـه‌ی پرته‌ونـه‌دا شـه‌معی شه‌بسـتانی کوومیتـم
کـه‌ی بـێ کـه‌ لـه‌ ئوفقـی عه‌ره‌بسـتانه‌وه‌ ڕۆژی
هـه‌ڵبێ گوڵـی خورشـیدی دره‌خشـانی کوومیتـم
واتـێ مه‌گـه‌ دوورم لـه‌ تـۆ نـه‌ی سـاحیبی خاتـه‌م
هـه‌ر هودهوده‌کـه‌ی بـه‌زمی سـلێمانی کوومیتـم
خه‌ڵکینـه‌ له‌بـه‌ر گه‌وهـه‌ری تـاجی سـه‌ری کـورده‌
قوربـــانی موحیتـــی عه‌ره‌بســـتانی کوومیتـــم
هه‌رچه‌نده‌ وه‌کـوو بیژن کـه‌ لـه‌ زینـدانی فیراقـم
بیلـلا بـه‌ تـه‌مای ڕۆسـته‌می داسـتانی کوومیتـم
عـاجیز مه‌بـه‌ ( بیخـود ) کـه‌ نیشـه‌للا وه‌کـوو یـه‌عقوب
نزدیکـه‌ ویصـالی مـه‌هی کـه‌نعانی کوومیتـم ( ٣٧ )

حاجی مستەفا پاشای یامولکی بە هەمان سۆزی نیشتمانیو نەتەوەیی‌یەوە سەبارەت بەم رووداوە گرنگە وتوویەتی:

هومایی دەوڵەتی نیشتوو بە سەر کوردا بیحەمدیللا
دۆعا بۆ بەختی کوردان کەین دەوامی بێ بیعەونیللا
بڵێ رۆژێکی ئیستیقلال هەزاران رۆژی تر دێنێ
بڵێ رۆژێکی ئازادی لە بۆ کوردان جیهان دێنێ
ئەوی کوردی ئەوێ هەڵسێ بەجێ‌بێڵێ سلێمانی
نەماوە دەوری دوو روویی لە بۆ ئینگلیس و توورانی[٣٨]

شاعیری کورد پەروەر (شیخ ئەحمەدی شیخ غەنی) کە نازناوی (فەوزی)[٣٩]یە بەم بۆنە پیرۆزەوە سۆزی خۆی دەربڕیوە:

شکرو لیللا موژدەبێ وانووری ئیمان هاتەوە
ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر شێری یەزدان هاتەوە
هەر وەکو یوسف لە زیندانی ئەسارەت هاتەوە
شاهی میسرە سەد شوکر وا رووبە کەنعان هاتەوە
سەف بە سەف زومرەی مەلایك دێن بە ئیستیقبالەوە
بانگ ئەکەن وا مەظهەری ئەلطافو رەحمان هاتەوە
عەرضی تەبریکات ئەکەن جنو مەلایك یەك بەیەك
زەمزەمەی خەیرولقدومە شاهی دەوران هاتەوە
شەمشەمە کوێرە لە داخا خۆی لە قورنێ حەقیەتی
شەو ئەما ظولمەت بەسەر چوو مەهی رەخشان هاتەوە
خاتەمی حوکمی لە دەس حیلەی‌شەیاتین دەرئەهات
تا جەنابی ئاسەفی مولکی سلێمان هاتەوە

جامی مەی سابێنە گەردش ساقیا تــوو بــی خــودا
مودەتێکــە دڵ حــەزینم جــانی جانـــان هاتــەوە
موتریبی خۆش لەهجە کوا دەنگی روبـابو عـودو نـەی
وەقتـی وەصڵــە قــاتیلی عومـری رەقیبــان هاتــەوە
جـەژنی کوردســتانە قوربــان مــەوقیعی قوربانی‌یــە
چۆن بە قوربانی نــەبم وافـەخری کـوردان هاتــەوە[40]

رۆژی ۱۹۲۲/۹/۲۹ شـێخی نــەمر گەیشــتە بـەغدادو دوای دیدەنــی مــەلیك فەیسەڵو نوینەری باڵای بەریتانیا (سیر پیرس کۆکس) لەرۆژی ۱۹۲۲/۹/۳۰ دا گەیشـتەوە شـاری سـلیمانی‌و لـە رۆژی ۱۰ی تشـرینی یەکــەمی ئـەو سـاڵەدا فەرمانی ژ۱) ی حوکمداری کوردستان بڵاوکرایەوە کە دەڵێت:

(مووەفەقەن هاتوومەتەوە، لە ئیمرۆوە دەستم کرد بە تەدویری پەروانـەی حوکومەتو موحافەزەی مەوجودی‌یەت و ئیستیقلالی‌یەتی کوردستان) [41]

حوکمداری کوردستان

مەحمود

لە رۆژی ۱۰تشرینی دووەمی ۱۹۲۲ دا بە نـاوی (تەشـکیلاتی حوکومــەتی کوردستان) ەوە کابینەیەکی دامەزراند[42] و لە ناوەراستی هەمان مـانگدا نـاوی خۆی بە (مەحموود- مەلیکی کوردستان) نیشاندا[43]

بە بۆنەی هاتنەوەی حوکمـداری کوردسـتان لەناوەراسـتی مـانگی تشـرینی یەکەمی ۱۹۲۲دا میر مەحموود خانی دزڵی بەخۆیو خزمو کەس‌وکارو هـەندێ لـە جەنگاوەرانی‌یـەوە گەیشـتە سـلیمانی‌و رۆژنامـەی بـانگی کوردســتان ئــەم هەواڵەی بڵاوکردووەتەوە:

((جەنابی مەحموود خانی دزڵی))

*ـای مەشهورانی هەورامی جەنابی مەحموود خانی دزڵـی لەگـەڵ خۆی عەلی محەمەد خان و محەمـەد رەشـید بـەگ کوڕانـی جـان‌الله بەـ ـ ـولڵابەگی سەرتیپ و محەمەد عەلی بەگی حەبیب الله بەگ و محەمەد عەلی بەگی سەردار بەگ لەگەڵ قەریبی سـەد سوار مەعی‌یەتیان بۆ شـەرەفیابی زیـارەتی حـەزرەتی حوکمـداری کوردسـتان وارد سـلێمانی و لـە خـانووی عـەبدولرەحمان قـەپتانچی کـە بۆیـان ئیحضـار کرابـوو موسـافیر بـوون. بـە خێربێن)*[44]

بە دروست بـون و دامەزراندنی‌حوکومـەتی دووەمـی شـێخ مـەحموود سـەر لـەنوێ پـلان و دەسیسـەی ئینگلیـز سـەری هەڵدایـەوەو لـە بـیرورا بۆچـوون و هەڵس‌وکەوتی‌شێخ زارەترەك بووبوون بە تایبەتی لەو کاتەدا کێشەی مووسڵ لە ئارادا بوو، ئێمە لێرەدا نامانەوێ سەر بوردێکی سەرتاپاگیری ئەم مەسەلەیە باس بکەین و وردو درشتی هۆیەکانی‌بخەینە روو تەنیا ئەوەندە دەڵێین کە (ئەو حکومەتەی شێخ مەحموود لە تشرینی دووەمی سالی ۱۹۲۲ دایمەزراند لە بەر گەلێك هۆی ئاڵۆزی ناوەکی و دەرەکی بۆ ئینگلیز دەستی نەئەدا بۆیە دەبوو نـاوی لـە نەخشـەدا نـەمێنێ)[45] و (رۆژی ۱۹۲۳/۲/۲۹ بەیاننامـە بەسـەر سلێمانی‌دا بڵاوکرایەوەو داوا لە مـەلیکی کوردسـتان کـرا چۆڵـی بکـات و دوو بۆمباشیان دا بە بازێڕەکەدا)[46] .

دیارە بەم کارەش سەر لەنوێ کێشەو پەیوەندی نێوان حوکومەتی دووەمی باشووری کوردستان و داگیرکارانی ئینگلیز گەیشتە ئاستێکی ترسناك و شێخی نەمر لە شـەوی ۱۳\۱۹۲۳/۳/٤دا بـەناچاری بـەخۆی و هێزەکانی‌یـەوە کشـایەوە ناوچەی سورداش و ئەشکەوتی‌جاسەنەی کردە بنکەو مەڵبەندی سەرکردایەتی خۆی، ئەوەیشی لە یاد نەکرد کە ئەوچاپخانەی (بەلەدی‌یە) ی پێشتر رۆژنامەی (رۆژی کوردسـتان)ی پێ‌چـاپ دەکـرا بـەجێ‌ی نـەهێڵی و بیگەیەنێتـە هـەواری

تازەی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی کوردیو (ئەمەیش بۆ خۆی گەورەترین بەڵگەی بەرزبوونەوەی بایەخی ڕۆژنامەنووسی‌یە لە ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغەی گەلی کورددا)[٤٧] و لە ڕۆژی ١٩٢٢/٣/٨ دا بەو چاپخانەیە بەیانی ژمارە (١)ی چاپ کردو تیایدا ئینگلیزەکانی بەبێ بەڵێن ناوبردووە، دواتر لەڕۆژی ١٩٢٢/٣/٢٨دا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (بانگی حەق) ی بە دوو لاپەرە و قەوارەی ٢١×٣٢ سم لە ئەشکەوتی جاسەنە بڵاوکردەوەو لە ژێر ناونیشانی ڕۆژنامەکە نووسراوە (ناشکێ بەتۆپ‌و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق) و (غەزەتەیەکی ڕەسمی لە قەرارگاهی عمومی ئوردووی کوردستان طبع دەکرێو غایەو ئەمەلی استحصالی حقوقی کوردانە).

ناوەڕۆکی ژ(١) بابەتیکی سیاسی‌یەو بە حەوت خاڵ باس لە ڕووداوەکانی ئەو ماوە مێژوویی‌یە دەکات‌و دەڵێ:

(ئینگلیزەکان درۆیان لەگەڵ کوردا کردووەو لە بەڵێنی خۆیان پاشگەز بوونەوە)و ژ(٢)ی ڕۆژنامەکە چاپ نەکراوەو بە مسوەدەیی ماوەتەوە،بەڵام ژ (٣) ی ڕۆژی ١٩٢٢/٤/١٢ چاپکراوەو هەندێ تەعلیماتی تێدایە بۆ قوماندانی مەفرەزەی هەشتەمی پیادەو باس لەوەکراوە کە ئەم تەعلیماتە بۆ هەیئەتی مودافەعەی میللی‌یەو سەرجەم تەعلیماتەکان دە برگەن‌و بەناوی (مەحموود باش قوماندان‌و مەلیکی کوردستان) بڵاوکراوەتەوە[٤٨]

ڕۆژنامەی بانگی حەق کە مەبەستی بنەرەتی هاندانی جەماوەر بوو دژی کردەوەی ئینگلیزەکان‌و تەنیا سێ ژمارەی لێ بڵاوکراوەیەوەو فڕۆکەکانی ئینگلیز تەنگیان بە شێخ مەحموود هەڵچنی‌و بەناچاری ناوچەی سورداشی چۆڵکردو ڕووی لە (پیران) کرد. دیارە ڕۆژنامەکەیش(باس لەو حەقە ژێرپێنراوە دەکات کە ئینگلیز کردی بە قوچی قوربانی بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆی).[٤٩]

رۆژی ١٩٢٢/٦/١٧ جارێکی تر ئینگلیزەکان سلێمانییان چۆڵکردەوەو شۆرشگێرانی کورد لە پێش هەموویانەوە کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند گەیشتەوە سلێمانیو بەناوی شێخی ئەمرەوە بەرێوەبردنی کاروباری ناوچەکەیگرتە دەستو شێخ دواتر لەرۆژی(١١)ی تەممووزی ئەو ساڵەدا گەرایەوەو لەم رۆژگارەدا رۆژنامەیەکی نویی بەناوی (ئومێدی ئیستیقلال)[٥٠] بڵاوکردەوە.

ئەم هاتنەوەیەی شیخی ئەمر زۆری نەخایاندو ئاشی پلانی ئینگلیزو لایەنگرانی کەوتەوە گەرو لەکۆتایی حوزەیرانی ١٩٢٤دا سلێمانی بەجێهیشتو سەرلەنوێ شەرو بزوتنەوەو جموجوڵێکی سەرتاسەری باشووری کوردستانی گرتەوەو ئینگلیزەکانیش کوناوکون بەدوای شێخ مەحموودو خانی دزڵیو لایەنگرانیدا دەگەرانو فرۆکەی ئینگلیزی ناوچەکانی دابێژابوو. ئێمەیش لێرەداو بەشێوەیەکی کورت چمکێکی ئەوبزوتنەوەو شەرو بەرەنگاربوونە دەخەینە بەرچاو...

لەهەرجاریکدا کەشیخی ئەمر تەنگی پێهەڵچنرابێو رووی کردبێتەوە ناوچەکانی دەرەوەی سلێمانی کەسایەتییە ناسراوەکانی کوردو لایەنگرانی پەلاماری دوژمنیان داوەو هەراسانیان کردوون، بەتایبەتی شۆرشگێری ناوچەی دزڵیو سەرداری هەورامان مەحموود خانیدزڵی هەرساتەی لەسوورچیکەوە بارگەوبنەیان کردووە بەسوورتوو، ئەوەتا (ئەدمۆندز)سەبارەت بەورۆژانەی کەشێخی ئەمر دوای حوکمەتی دووەمی سلێمانی چۆڵکردووەو دەڵێت:(رۆژی ٢٣ی نیسانی ١٩٢٣گەشتی دووەمم بوو بۆ گوندی- یالان پێ- لەناوچەی هەورامانو ئەمویست چاوم بەمەحموودخانی دزڵی بکەوێت کەگەورەی بنەماڵەی بارام بەگی بوو، کەلەوکاتەدا لەدەست بەسەریو بەندی گەرابووەوە، بەلام ئێستا سەرلەنوێ ئالای شۆرشو بزوتنەوەی

هەڵکردووەتەوەو ناوچەکەی شلەژاندووە، ئەم هەڵوێستەی مەحموودخانی دزلی ئێمەی ناچارکرد کەفرۆکەکانمان چەند جارێك گوندەکانی سەرسنوور بۆردومان بکات و ئەمەیش وای کرد کەداوای رێکەوتن بکات)[51].

لەکاتێکدا کەشێخ مەحموود لەتەمووزی ١٩٢٤دا بەتەواوی سلێمانی چۆڵکردبو لەرۆژی ١٨ی ئابی ئەو ساڵەدا رۆژنامەیەکی ژەهراوی بەناوی (ژیانەوە)[52] یەکەم ژمارەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بڵاوکرایەوە کەناشیرینترین جوێن و قسەی سووکی بەخۆوەگرتبوو،گەرسەیری هەریەنجاو شەش ژمارەکەی بکەین دەبینین کەبەکرێگیراوانی ئینگلیزو داردەستەکانی لەسەرلاپەرە چڵکنەکانی تەراتێنیانەو بەناوی وشەی پیرۆزی‌شیعرو ئەدەبەوە پلاری رەزاگرانیان گرتووەتە شێخ و نەتەوەی کوردو بزوتنەوەی نەتەوایەتی‌یەکەی‌و دواتریش بۆماوەیەك رۆژنامەی (ژیان)[52] هەمان رێچکەی گرت بەلام بەشێوەیەکی تر.

سالی ١٩٢٤لەناوچەی شەمیران-حەمەی سان ئەحمەد- کەسەرکردەی- یەزدان بەخشی- بوو ناوچەکەی ئاڵۆزکردوو وەك لایەنگرێکی شێخی نەمرو خانی دزلی بەرامبەر بەئینگلیزەکان وەستاو زەبری کوشندەی لێدان و لەئەنجامدا فرۆکەکانی ئینگلیز ناوچەکەیان بۆردومان کردو(سێ‌فرۆکە ی جەنگی هاتنە سەر شەمیرانی نزیك وارماوە، گوللەی شۆرشگێرانی ئەوناوچەیە تەنکی بەنزینی یەکێکیانی پێکاو فرۆکەوانەکەی ناچاربوو بنیشێتەوە)[54] و لەلایەکی‌ترەوە شۆرشگێران بۆماوەیەك ناوچەکەیان لەدەسەڵاتی ئینگلیز جویکردەوە.

بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە(بۆمباو گوللە بارانی فرۆکەو تۆپ و زرێ پۆشەکانی ئینگلیز رژێمەکەی شێخ مەحموودیان رووخاند، بەلام ئەوانیش نەیان توانی دوا رادە بۆ راپەرینەکەی دابنێن کەلەقۆناغی شەری چەتەگەری‌دا

بەتەواوی ئینگلیزو لەوانیش زیاتر دەستەو دایەرەی- مەلیك فەیسەڵ-یان وەرس کردبوو، هەرڕۆژە لەلایەکەوە لێیان راستەدەبوونەوە، ئینگلیزەکان بەوردی ئاگاداری ئەوەیش بوون کەهەست و نەستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەگەڵ شێخ و دروشمەکانیدایە)[55].

نائومێدیو دەسەوسانی ئینگلیزەکان بەرامبەر بەکوردو شێخی نەمر گەیشتە رادەیەك کەبگەنە ئەوئەنجامەی کەفرۆکەو تۆپ و بۆردومان دادیان نادات و شاخە سەرکەشەکانی کوردستان بووەتە پەناگەی شێخی نەمر، بۆیە پەنایان بردە بەرپلانیکی‌تر بەوئومێدەی کەسوودیکی هەبێ و لەم رێگەیەوە شتێ دەستگیر بکەن.

دانانی خەلات بۆلەناوبردنی شێخ و دلسۆزەکانی؛

(نوینەری بالای ئینگلیز لەعیراق-سێر هێنری دۆبس-رۆژی ٢ی‌مایسی ساڵی ١٩٢٥لەشاری کەرکوك و بۆجێ‌بەجێ‌کردنی پلانی لەناوبردنی شێخ مەحموود کۆنگرەیەکی بەرزی سازکرد، بەشدارانی کۆنگرە بریتی‌بوو لە- هینری دۆبس و سەرەك وەزیران یاسین هاشمی و جیگری سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لەعیراق-س.تی. دۆدنگ-و جێگری سەرلەشکری بەریتانی لەعیراق و راوێژکاری وەزارەتی بەرگری عیراق- لیفتینانت کۆلۆنیل کامیرۆن و یاریدەدەری راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆی عیراق و سەرپەرشتکاری کارگێری سلێمانی و سەرکردەی کەرت رۆب و سەرپەرشتکاری کارگێری کەرکوك و سەرپەرشتکاری پۆلیسی کەرکوك).[56]

(بەشدارانی کۆنگرە بەدووروودرێژی لەورێبازە سەربازی‌یەیان کۆڵی‌یەوە کەبەلایانەوە پێویست بوو بۆ دامرکاندنەوەی بزوتنەوەکانی شێخ مەحموود پەیرەوبکرێ و خەرجی پێویستیان بۆ دیاری‌کردو پوختەیان لەپێنج خاڵی سەرەکیدا تۆمارکرد، سەرباری ئەوەیش بریاریاندا ٢٠هەزار رۆپی تەرخان

بکریّ وەك خـەڵات بـۆ هەرکەسـیك شـیخ مـەحموود بـەزیندویی یابـەمردوویی دەستگیر بکات، جگە لە١٠هـەزار روپـیّ بۆ هەریەکیك لەکەریمی فـەتاح بـەگی هەمەوەندو سابیرو عەبدوڵلای کورانی کەریمی فەتاح بەگو خەلیفە یۆنس)[٥٧].

(دوایگەرانەوەی بۆبەغداد- هینری دۆبس- یەکسەر بریارەکانی کۆنگرەی لەگەڵ فـەرماندەی گشـتی هـێزی ئاسمـانی بـەریتانی لـەعیراق هەڵسـەنگاند، ئـەمیش هـەمویانی پەسـەند کـرد تـەنیا ئەوخاڵـەیان نـەبیّ کـەدەربارەی گواستنەوەی فەوجیکی لیڤی بوو بۆ هەڵەبجە، فەرماندەی گشتی پیّی وابوو ئەولایەنەی بریارەکان پیۆیستی بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، رۆژی ٥ی مایسی ساڵی١٩٢٥سکرتێری دۆبس نامەیەکی تایبەتی نارد بۆسکرتێری ئەنجومەنی وەزیـران کەلـەپینج خـاڵی سـەرەکیدا دیسـان باسـی بریارەکـانی کۆنگـرەی کەرکوكو وتوێژی دۆبس لەگەڵ فەرماندەی گشتی هێزی ئاسمانی بەریتانی لەعیراق دەکات)[٥٨].رۆژی هەشتی حوزەیرانـی سـالی ١٩٢٥سـکرتێری-هینری دۆبس- بۆردلن نامەیەکیتری ناردووە بـۆ سـکرتێری ئەنجومـەنی وەزیـرانو دەڵیّ:(نوینەری باڵا هینری دۆبس ٢٠هەزار روپیّ بۆ کوشتن یان بەدیل گرتنی شێخ مـەحموود بەپارەیـەکی کـەم دەزانـیّ، بۆیـەکا پیشـنیاردەکات بکرێتـە ٦٠هـەزار روپـیّ، هـەروەها لـەبریتی ١٠هـەزار ٢٠هـەزار روپیێش بۆ کوشتن یـان بەدیل گرتنی کەریمی فتاح بەگی هەمەوەندو سابیر کوری تـەرخان بکریّو واز لەخەلیفە یۆنسو عەبدوڵلای کوری کەریمی فەتاح بەگ بهێنریّ، واتا ناویان لەپلانەکەدا بکوژێنرێتەوە)[٥٩]و پیۆیست بەدانانی خەڵات ناکات.

دیـارە ئینگلیزەکـان پلانەکـەیان بۆنـەچووە سـەر چونکـە (شـێخ مـەحموود بەشـێك بـوو لەبزوتنەوەیـەکی بـەرفراوان کـەمۆی مـانو ژیـانی لـەبیّ مـافی گەلیکـەوە سـەرچاوەی وەردەگرت)[٦٠] دوای بریـاری خەڵاتـەکان هـەندیّ کـەس چـاوەروانی ئـەم خەڵاتـە چـەورەبوون، (مێژوونووسـی شـارەزا عـەبدولرەزاق

حەسەنی لەزاری بابەعەلی کوری شێخ مەحموودەوە باسی ئەوە دەکات چۆن لەوسەردەمەدا لایەنگرانی شێخ ئاشووری‌یەکیان بەدیل گرتووە کەخۆی دانی پێداناوە بۆ کوشتنی شێخ هاتووە.[61]

بەم پێیە ئینگلیزەکان بۆبنەبرکردن و فەوتاندنی شێخی نەمرو بزوتنەوەکەی لەسۆراخی بەردەوام دابوون و تەنانەت بەرداوبەرد شوێنی کەوتبوون ئەوەتا (رۆژی ٧ی تەمووزی سالی ١٩٢٥لەپێنجوینەوە بەبروسکەرەوانەی بەغدادو لەوێشەوە رەوانەی لەندەن کراوەو دەلێ:

-ئیمرۆ بەیانی شێخ مەحموود بەیاوەری کەریم بەگی فەتاح بەگو سابیر[62] لەتەك سەدو پەنجا کەس لەپیاوەکانی بەخەلووزەدا تێپەرین کەپێنج میل لەولای رۆژهەلاتی پێنجوینەوە دوورە، شێخ لەتیف و شێخ رەوفی لەگەلبوو، دوێنێ بەهێرخان[63] وشیخ بابەعەلی کوری بەهەمان ریگەدا تێپەرین، بەرلەوان ئایشەخانیش[64] رۆژی چواری تەمموز ئەوریگەیەی بری و هەموویان بەرەو هەورامان دەرۆن)[65] جموجولی شۆرشگێرانی کورد گەیشتە ئەورادەیە کەبەئاشکرا بەیاننامە بەسەرناوچەکاندا بلاوبکەنەوەو بەنامە دەسەلاتداران بترسێنن و تەنانەت (ژمارەیەك لەهۆزەکانی نزیك کانە نەوتەکان باجیان دەدایە شێخ مەحموود نەك بەمیری) [66]بەم پێیە شۆرشگێرانی کورد دەسەلاتیان بەسەرناوچە گرنگەکاندا بلاوکردبووەو شیرازەی لەدەست ئینگلیزەکان دەرچووبوو، (سەرپەرشتکاری کەرکوك ئیدمۆندز رۆژی ٢٠ی ئەیلوولی سالی ١٩٢٥دەقی ناوەرۆکی ئەو ئاگاداری‌یەی ناردووە بۆ راویژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ- کۆرنوالیس-و وینەی داوە بەسکرتێری-هێنری دۆبس-ی نوینەری بالا لەبەغدا، سەرەتای ئاگاداری‌یکە بەم جۆرەیە:

*-بۆگشت دانیشتوانی قەرەحەسەن ئاگادارتان دەکەم کەمن سابیربەگی‌کوری کەریمی فەتاح بەگم لەلایەن مەلیکی کوردستانەوە نێردراوم، لەومێژەی*

*کەلەگەڵمدایە بریتی‌یە لە ٣٠٠ سوارە، لەهیچ مەترسن، من بۆ کۆکردنەوەی باج هاتووم- لەکۆتایی‌دا دەڵێ: ئەم راگەیاندنەم گوندلو گوند بنێرن تانەگاتە کەرکوك*

**ئیمزا**

**محەمەد سابیر**

**فەرماندەی بەتالیۆنی کوردستان**

لەهەمووی پرماناتر ئەوەیە کەمەجید یەعقوبی نامەیەکی هەڕەشەی تایبەتی لەکەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندو سەید محەمەدی جەباری‌یەوە بۆ هاتووە کەتێیدا ئاگاداریان کردووە بێتوشار بەجێ‌نەهێڵێ ئەیکوژن، مەجید یەعقوبی لەتاوا بەخاوو خێزانەوە رۆژی ٢١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥کەرکوکی بەجێ‌هێشت و بەپەلەپروزکێ گەیشتەوە بەغدا)[٦٧].

دیارە لەبەرچالاکی بەردەوامی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوری بوو کەفرۆکەکانی ئینگلیز کوناوکون بەدوایدا ویڵبوون و دەیانویست تۆڵەی بەروودوایان لێبکەنەوە بەڵام بێ‌سوود بوو، بۆنموونە (ئەمە دەقی بروسکەیەکی بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی‌یە لەسلێمانی کەرۆژی ٢٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥لەوبارەیەوە داویێتی بەفەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لەبەغداد)[٦٨]:

(چالاکی‌یەکی فڕۆکەوانی: سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە بەکاتی ناوخۆ پێنج فڕۆکە[٦٩] چوونەسەرخانەقین و ناوچەی روباری تانجەرۆ بۆگەڕان بەدووی کەریمی فەتاح بەگ و سابیردا، هیچ بەدی نەکرا، سەعات حەفدەو نیو بەکاتی ناوخۆ سێ‌فڕۆکەی‌تر چوونە سەر -کانی گوڵەو جێشانەو هەزار مێرد-دیسان بۆگەڕان بەدوای کەریمی فەتاح بەگ و سابیردا، لەهەزارمێرد سێ‌ئەسپ بینران دەستڕێژیان لێکراو یەکێکیان پێوەبوو)[٧٠].

دوای روخاندنی حکومەتەکەی شێخی نەمر هەندێك لەهۆزەکانی کورد لەساحەکەدا کشانەوەو بەڵام ئەم دوورکەوتنەوەیە نەبووە هۆی لاوازی لەشکری شێخ مەحموود بەڵکو(بەرەبەرە خۆی گرتەوەو رۆژ بەرۆژ بزوتنەوەکەی زیاتر پەرەی دەسەندو لەزۆرلاوە چوون بەدەنگییەوە، هەربەپێی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز خۆیان لەیەکێك لەشەرەکانی ئەوڕۆژانەی شێخدا سەد کەسیناوچەی سرۆچكو هەشتا بەرزنجەییو حەفتا هەمەوەندیو پەنجا شارباژێری بەشداریان کردووە)[٧١].

(لەشەرێکیتریدا کەلەحوزەیرانی سالی ١٩٢٥لەنزیك کەنارو روویداوە شیخ مەحموود بەپێی گێرانەوەی بەڵگەنامە ئینگلیزییەکان نزیکەی ٥٠٠چەکداری لەگەڵ بووە کەبەشێکیان پشدەریو لەژێر فەرماندەی-پیرۆتی حاجی رەسول ئاغا-دابوون بەشێکیتریان هەمەوەندو لەژێر فەرماندەی کەریمی فەتاح بەگو سابیری کوریدا بوو، ٥٠کەسیشیان لەژێرفەرماندەی-سەید رەئوفو یونسە فەندی-دابوون)[٧٢].

سالی ١٩٢٦شێخ مەحموود ناوچەی-شارباژێری- کردە بنکەی تایبەتیخۆیو شەرو بەرەنگاربوونەوە لەنێوان شۆرشگێرانی کوردو سوپای ئینگلیزدا هەموو کووچەو پەنایەکی گرتەوە، سابیری کوری کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند لەگەڵ سوارەی هەمەوەندا لە١٩٢٦/٢/٢٨دا لەکەندەکەوە هێزیکی دوژمنی تاناوشاری سلێمانی راونا، لەمینی *حەمەی ئیمام* لەنزیك تەینال لەمەفرەزەیەکی نەقلیاتیداو لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆ مەلیکی کوردستان نارد؟

*بۆ حەزرەتی مەلیك*

*(مەندێ عەسکەرم بەدیل گرت و دولنیان کورد بوون، بەمەرقەدی کاك ئەحمەد ئەومنە ئازایانەو دلێرانە شەڕیان دەکرد هەرچەندم کرد نەمتوانی بی‌یان کوژم، پیاوی ئازا نابێ بکوژرێ، بۆیە هەربووکیانم بەرەڵلا کرد)*[٧٣]

نیمزا

ئەمینی حەمەی ئیمامی هەمەوەندی

دۆکیومێنتی ژC.O.730-15 رۆژی ١٩٢٦/٧/٢٠

لەبڕگەی ٤٦٣دا دەڵێ:سایبری کوڕی کەریم بەگ بەپەنجا چەکدارەوە هاتووەتە ناوچەی بازیان[٧٤].

دوکیۆمێنتی ژC.O.730-95 رۆژی ١٩٢٦/٨/١٨دەربارەی شەڕی پێنجوێن لە١٩٢٦/٦/١هەتا ١٩٢٦/٧/١١ (لەدۆڵەسوور لەگەڵ هەورامییەکاندا شەڕێك روویدا کەزیانی ئێمە کوژاوێك‌و لەگەڵ بریندابوونی سێ‌لیڤی).

(لە١٩٢٦/٦/١٣دا بەتالیۆنی عیراق لەژێر سەرکردایەتی کاپتن Richو بەتالیۆنی لیڤی عیراقی بەسەرکردایەتی ملازم Curtias روویان کردە مولاكMulakو لەوناوەدا بەرەنگاری هەورامییەکان بوونەوە.)

(لە١٩٢٦/٧/٢٥دا بڕیاردرا خەرمانەکانی (کانی مانگا)و (نالپارێز)و (یالانپێ)بەهۆی هێزی ئاسمانی‌یەوە بسوتێنرێن، مەحموودخانی دزلی کەلەگوندی (ئەحمەد ئاوا)یە بەخۆی‌و ٢٠٠سوارەوە نامەیەکی هەڕەشەی ناردووە بەرانبەر بەسووتاندنی ئەوخەرمانانەو دەڵی تۆڵەیان لێدەکەمەوە)[٧٥]

نیمزا

Sorel Cameron

Cmmander of Colm

موسل١٩٢٦/٨/١٨

دۆکیۆمینتی ژC.O.730-95رۆژی ۱۲/۱۰/۱۹۲٦سەبارەت بۆردوومان کردنی دێهاتەکانی ناوچەی هەورامان:

(هۆی بۆردوومانیکردنی دێهاتەکانی هەورامان وەکو -کانی گوڵ-و -ئەحمەد ئاوا-و -یالانپێ-بۆئەوە بوو کەسزابدرێن بەرانبەر بەهاوکاریکردنیان لەگەڵ شێخ مەحموود،هەرچەندە دێهاتەکانی هەورامان هەموویان بەشداریيان کردبوو، بەڵام تەنیا ئەوچەند گوندەمان دەستنیشان کردو ئەوانیتر هەرەشەیان لێکراو دەغڵو دانیان سووتێنرا بەڵام زیانی گیانی نەبوو.[٧٦]

دۆکیۆمینتی ژAide Memoire C.O.730-107

رۆژی۱٦/۱۱/۱۹۲٦کەباسی خۆلاسەی بزوتنەوەکان دەکات لەناوچەی هەڵەبجەو پێنجوێندا:

<u>راپۆرتی یەکەم</u>: لەمانگی ئەیلوولی ۱۹۲٤دا شێخ مەحموود دەستی کرد بەدوژمنایەتی لەناوچەکانی هەڵەبجەو پێنجوێندا کەلەوناوانەدا دۆستی بەهێزی هەبوو وەکو مەحموودخانی دزلیو پەلاماری هێزەکانی عیراقیدا، لەکانوونی دووەمی ۱۹۲٥دالەمەریوان خۆی حەشاردابوو، یارمەتی باشی لەحاکمی بانە وەردەگرتو خێزانەکەیشی لەگوندی-کەندەسوورە-ی ناوخاکی ئێراندا بوو، لەمانگی شوباتەوە هەتا حوزەیرانی۱۹۲٥شێخ مەحموودو تاقمەکەی لەرۆژهەڵاتی سلێمانیدا جموجوڵیان هەبوو.

لەمانگی مایسی ۱۹۲٥دا هێزی لیڤی سوارەنێردرا بۆ سلێمانیو هەڵەبجەو ئەوناوە زۆرنائارام بوو، بەڵام لەحوزەیرانەوە وردە وردە هەڵوێست باش بوو، ئەو عەمەلیاتانەی کەکران شێخ مەحوودیان ناچارکرد بچێتە خاکی ئێرانەوە لەناوچەکانی مەریوانو هەورامانڕا هاتو چۆی دەکرد، لەمانگی ئابدا جارێکیتر بەپاڵپشتی کوردە ئێرانییەکان هاتەوە ناوچەی پێنجوین بۆئەوەی رێگا لەوجافانە بگرێ کەلەکوێستانەوە دەگەڕانەوە، بەڵام بەهۆی ئەوهێزی لیڤییەی لەسلێمانییەوە نێرابوو ناچارکرا خۆی بکشێنێتەوە بۆ (باشماخ)و (ولەژێر)یکرد بەبنکەی خۆی. لەشوباتی ۱۹۲٦دا شێخ مەحموود لەگەڵ

سەرکردەیەکی ئیرانیدا لە(بانە)کۆبۆوەو بەلام لەوکۆبوونەیە چی تیدا باس کرابوو نەزانراوە.

لەتەموزی١٩٢٦دا شێخ مەحموود هێزیکی گەورەی لەعەشایەری ناوچەی بانەو مەریوانو رەوەرامان کۆکردەوەو سنوری عیراقی شلەژانو بەرەنگاری کۆچەرییەکان دەبووەوەو لەو عەمەلیاتەی هێزی ئاسمانیمان کەدژی شێخ مەحموود کرا فرۆکەیەکمان بەناچاری نیشتەوەو ئەفسەریکی بەریتانیو میکانیکییەکی تێدابوو بەدیل گیرانو نێران بۆ (ولەژێن)و بەهۆی فرۆکەی ئێمەوەو لەژێر فشاری حوکومەتی ئێراندا شێخ ناچار کرا هێزەکانی لەعیراقدا بکشێنێتەوە بۆ (ولەژێن).

لەمانگی ئەیلوولی ١٩٢٦دا شێخ مەحموود هێزیکی لەکوردی ئیران پێکهێناو بەتایبەتی لە(گەلباخی)و (رەزا)و (تیلەکۆ)و لەناوچەی مەریوان کۆبوونەوەو بەرەو هێزەی (پێنجوین)ی گرت. هێزیك لەسلێمانییەوە نێررا بەلام شەرنەکرا بەئومێدی ئەوەی دەست بکرێ بەگفتوگۆکردن بۆ بەردانی ئەوفرۆکەوانە.

لەمانگی مارتی ١٩٢٤دا مەندوبی سامی نامەیەکی نارد بۆ رەزا شاو داوایشی لەسەرەك وەزیرانی ئیران کرد کە(مەحموود خانی دزلی )بکشێتەوە بۆ ناوخاکی ئیران لەگەڵ حەمەرەشید بەگی وەیسەو سەرکردەکانی تر، هەرچەندە وەلامی ئیران هاتەوە کەئاگاداری مەحموودخانی دزلیو تاقمەکەی کردووە کەبەهیچ جۆریك نابێ یارمەتی شێخ مەحموود بدەن بەلام ئەوەتەنیا هەرقسەبوو[٧٧].

شێخ مەحموود لەتشرینی یەکەمی سالی ١٩٢٦دا بەنهێنی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کەوتە گفتوگۆ، بۆ ئەم مەبەستە (سەید ئەحمەد بەرزنجی) وەك نوێنەرو دەم راستی خۆی ناردە بەغداد، (لەوراپۆرتەی کەئینگلیزەکان سەبارەت بەرووداوەکانی سالی ١٩٢٧داویانە بەکۆمەلەی نەتەوەکان-عصبة الامم- باس لەم وتو وێژەکراوەو- سەید ئەحمەد بەرزنجی-یان بەئاژاوەچی باشووری کوردستان ناوبردووە(Stormy petrel)[٧٨] دیارە وەکو دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دەلێت(دەبێ نیشتمان پەروەرو پیاوی دلسۆز لایهەموو

زۆردارو داگیرکارێك هەرناژاوەچیو یاخی گەرو پیاوخراپ بن).[٧٩] شێخی ئەمر لە٢/٧/١٩٢٧داهاتە سلیمانیو لە٤/٧/١٩٢٧داچووە، بەغدادو دوایی گەرایەوە -پیران-و کردی بەبنکەو شوێنی دانیشتنی، چونکە پیران مەریوانو هەورامانو بانەو جوانرۆو رەوانسەری بەدەورەوەبوون، لەهەمان کاتدا ڕێبازی گەرمیانو کوێستانی عەشیرەتی جاف بوو، ڕێگەیەکی نزیکی چەپەری سنەیش بووە لەلایەکیترەوە هەمان راپۆرتی سالی ١٩٢٧(ناوی سایرو عەبدوللای کورانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند دەبات، ئەوانیش لەورۆژەدا بەپیشەی باوو باپیرانیان دلێرانە بەرەنگاری داگیرکار هاتبوون، بەلکو ئەوکاتە وەك راپۆرتەکە دەلێ:تەنها ئەوان لەکۆری خەباتدا مابوونەوە، ئینگلیزەکان کوناوکون بەفرۆکەو سوارەو سەربازی لیڤی دوایان کەوتبوون)[٨٠].

### بزوتنەوەی نوێی شێخ مەحمود:

سالی ١٩٢٠عیراق دەیویست کەپەیمانێکی نوێ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا پێك بهێنێو دیارە بۆ ئەمەیش پێویستی بەوە هەبوو وەك سەرەتای کارەکە هەلبژاردنێك سازبکاتو وەك خۆیان دەیان وت(ئەعضای هەیئەی تەفتیشیە ئینتخاب بکرێ).

هەرلەوکاتەدا لەناو کوردەکاندا بەمەبەستی داواکاری مافەکانی کورد دەستەیەك لەروناکبیرو کەسایەتیە دەرکەوتووەکانی ئەوسەردەمە بەناوی (هەیئەتی وەطەنیە)کەوتنە جموجوولو خەباتێکی هێمنی دوور لەشەرو کوشتار،بەلام جەماوەری سلیمانی لەرۆژی شەشی ئەیلولی ١٩٢٠دا بارودۆخەکەیان ئالۆز کردو پەلاماری دەستکاکانی حوکومەتیانداو ئەنجامەکەیشی کوشتنو بریندار بوونی چەند کەسێك بوو، ئەمانە دەیان ویست کەهەلبژاردن نەکرێو بەرەنگاری بووەستن بەلام لەرۆژی١٥/٩/١٩٢٠دا حوکومەت کاری خۆی بەجێگەیاندو هەلبژاردنی پێك هێنا،لەلایەکیترەوە-

هەیئەتی وەطەنی یە -ئەم بارەگرژی یەی پێ خۆش نەبوو چونکە دەیزانی کەجڵەوی مەسەلەکەیان لەدەست دەچێ. دیارە ئەوپەیمانەی کەلەنێوان عیراق و ئینگلیزەکاندا ئیمزاکراو عیراق چووە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە-عصبة الامم-بەهیچ شێوەیەك توخنی مافەکانی کورد نەکەوتبوو، چونکە کەڕۆژی ۱۸/۷/۱۹۳۰بەندەکانی بڵاوکرانەوەلەمافە سەرەکی یەکانی کورد بێ بەری بوو،لەم بارەیەوە شاعیری خواڵێخۆشبوو (شێخ سەلام) زۆربەوریایی کۆمەڵەی نەتەوەکانی هەڵسەنگاندووەو هەرئەو توانیوێتی کەبەوجۆرە باسیان بکات و بەکارخانەی فەساد ناویان بەرێت[81].

عصبە الامم کۆمەڵی گەورە
بە پێچ و پەنا بەفێڵ و دەورە
بەجۆش و کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار
نەتوت ئەم قەومە نەکەم رستگار
ئەگەر راست ئەکەی هەڵی سوورێنە
بەس بۆسیاسەت هەڵمان پەرێنە
تەریق نابیتۆ تۆ چیت پێئەکەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن[82]
لەعەدالەتا کەی ئەمە دەبە
یاخو هەرشێوەو ئوسوڵی غەربە
کۆمەڵی درۆ جێگەی مەکروفەن
کوتەکی دەستی مستەر هەندرسن
خۆتۆ وەصی بووی، ئەقوام بوون هەتیو
دەمی کوردت کرد بەتەڵەی تەقیو

لەسلیمانی جادەی بەرسەرا
بەخوێناوی کورد ناوڕشێن کرا
چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە
لەلای تۆ هەلبەت حقوق کوشتنە
ناترسی تەئریخ لەعنەتت بکەن
کوتەکی دەستی مستەر هەندرسن
مەنشەنی فتنە کۆمەڵی تەزویر
وانەدەی حەقی -ئەقوامی صەغیر-
کارخانەی فەساد کۆمەڵی میحەن
کوتەکی دەستی مستەر هەندرسن[82]

لەلایەکی ترەوە چوار ڕۆژ دوای کارەساتی شەشی ئەیلوول واتا ڕۆژی ١٠/ی ئەیلوولی ١٩٢٠(جەمیل مەدفەعی) وەزیری ناوخۆی عیراق نامەیەکی بۆ شێخ مەحموود ناردووە کەئەوکاتە لە-پیران- دانیشتبوو:

س٢٢٩٨ ڕۆژی ١٠ئەیلوولی١٩٢٠

**بۆ جەنابی شێخ مەحموودی بەرزنجی موحتەرەم**

*(لەپاش ڕێزو سلاو.. بێگومان ئاگادارن کەچۆن هەندێ ئەشارەزاو سەرچل لە٦ی ئەیلوولدا لەناو شاری سلێمانی چییان کرد بەبۆنەی هەڵبژاردنی-هەیئەتی تەفتیشی-بۆ دەستنیشان کردنی- مونتەخەبی ثانەوی-و چۆن دەست درێژیکرایە سەر هێزی پۆلیس و عەسکەر کەلەئەنجامی ئەوەدا حوکومەت ناچاربوو چەند هەنگاوێك بنێ بەرانبەر بەوئاژاوە چییانەی کەبوبوونە هۆی ئەوکارەساتەو ئێستە دەست کراوە بەلێکۆڵینەوەو پرسیارکردن لەگەڵ ئەوانەدا.*

*بیستوومانە هەندێ گێرەشێوێن خەریکی نانەوەی ئاژاوەو پشێوینو خەریکن پروپاگەندەی ترۆ بڵاودەکەنەوە بۆئەوەی ئێوەش مان بدەنو دژی حوکومەت هەلسن کەئەمە لەگەڵ ئەو رێکەوتنو بەڵێنەی ١٦ی کانوونی دووەمی سالی ١٩٢٧دا ناگونجێو یەك ناکەوێ.ئێمە بروامان بەشارەزاییو دووربینیو ژیری ئێوەهەیە لەم رووەوە برواناکەین بەقسەی ئەو جۆرە پیاو خراپانە هیچ جۆرە کردارێك بکەنو لەورێکەوتنە لابدەن کەپەیمانو بەڵێنتان لەسەردابوو. لەبەرئەوە ئەوا بەم نامەیە داواتان لێدەکەین بەبێ دەنگی دابنیشنو ماوە نەدەن هیچ شتێکی وارووبدا کەببێتە هۆی تێکدانی ئاسایشی ناوچەکەو ئەوبەڵێنەی لەورووەوە داوتانە نەیشکێننو وابزانم بەبەجێهێنانی ئەمەدەتوانن پاکیو دڵسۆزی خۆتان بەرانبەر بەحوکومەت دەربخەن )*[٨٤].

ئیمزا
جەمیل مەدفەعی
وەزیری ناوخۆ
١٠ئەیلوولی ١٩٣٠

جگەلەم نامەیەی وەزیری ناوخۆ لەرۆژی ١٩٣٠/١٠/٢٠بەیاننامەیەك بەسەرشاری سلیمانیدا بڵاوکرایەوەو بەهەمان شێوە دژی کوردو مافەکانی دەدواو ئامانجی سەرەکی بەیاننامەکە هەرەشەو تۆقاندن بوو.

فروفێڵی ئینگلیزەکانو دەستگاکانی حوکومەتی عیراقو کارەساتی شەشی ئەیلوول بەتەواوی کاری کردە سەرهەستو نەستی شێخ مەحموودو سەرلەنوێ قۆناغێکی تری بزووتنەوەکەی دەست پیکرد، لەلایەکیترەوە دوای رووداوی شەشی ئەیلوول ژمارەیەك لەئەفسەرو روناکبیرانی ئەوسەردەمە ریزەکانی حوکومەتیان بەجێهێشتو خۆیان گەیاندە لایشێخ مەحموود، شاعیری خوا لێخۆشبوو(شیخ سەلام) لەم بارەیەوە دەلێ:(سالی ١٩٣٠لەسەر هەرای رۆژی رەشی شەشی ئەیلوول لەگەڵ سێ رەفیقما لەبەغدا بۆ ئینتیقام فیرارمان کرد

لەگەڵ رەئیس ئەوەل مەحموود جەودەت، رەئیس حەمید جەودەت، مولازم کامل حەسەن، چوونە پیران لای شێخ مەحموود، پاش چەند رۆژێك رۆیشتینە پشدەر، مەوجوودمان گەیشتە ٤٠٠سوار، هاتینە شارباژێر، دەست کرابە حەرەکات.)[٨٥] لەگەڵ بەردەوامی فشاری فرۆکەو بوردومان کردنو هەرەشەی ئینگلیزەکان بزوتنەوە کەلەگەشەسەندنو بلاوبوونەوەدا بوو، شەروبەرەنگاربوونەوە پینجوینو چوارتاو هەلەبجەو هەورامانو شارەزوورو دۆلی سورداشو دەربەندیخانو قەرەداغو گەلێ شوێنیتری گرتەوە. ئینگلیزەکان خۆیان لەوراپۆرتەی کەسەرکردەی هێزی ئاسمانی لەعیراق دەربارەی راپەرینەکەی ئەورۆژگارەی شێخ مەحموود وتویانە (بارودۆخەکە زۆر ئالۆز بوو بەرادەیەکی ترسناك کلپەی سەندبوو، شێخ مەحموود هەموو توانای بۆ بلاوکردنەوەو پەرەپێدانی دەسەلاتی خۆی بەکارهێنا، لەراستیشدا چەند بەلگەیەك لەئارادابوون دەربارەی ئەوەی کۆششەکەی لەپتر لەناوچەیەك بەفیرۆنەچووبوو، دیاردەی زۆرهەبوو وایان دەردەخست کەواخەرێکە بارودۆخەکە بەلای باشیدا بۆنەو بشکێتەوە، مەترسی راستەقینەی خۆی نواند، خەریك بوو شۆرش بلاوببێتەوەو پەرەبسێنێ بۆ شتێکی ترسناکتر لەوەی بریتیبێ لەچالاکی پەرەوازەی دەستەیەکی بچووکی یاخیبوو لەناوشاخەکانی ئەودیوی سلێمانیدا)[٨٦].

ئاستی راپەرینی نوێی شیخ مەحموود گەیشتە رادەیەك کە(رۆژی ٢٨ی مارتی سالی ١٩٣١-سەعد صالح-ی بەناوبانگ لەناوهۆلی پەرلەماندا هاواری لێهەلسێو بلێ:

-بەرلەهەموشتێکی تردەبێ لەدەست شێخ مەحموود قو تاربین، ئەگەر دەرەقەتی نایەین ئەوا پێویستە سەربەخۆیی بدەینێ، ئەگەر دەرەقەتیشی دێین، ئەوا پێویستە یەکجارەکی لەناوی بەرین، ئەمە مەسەلەی ژیانی ولاتە، یادەبێبتوانین شێخ مەحموود لەناوبەرین، یادەبێ ئەومافانەی بێبدەین کەداوایان دەکات..)[٨٧].

لەشکری شیخ مەحموود گەیشتە ناوچەی گەرمیان و بۆوەشاندنی گورزی توندترو لەرۆژی ٥ی نیسانی ١٩٢١دا شەری بەناوبانگی ئاوباریك قەوماو لەم شەرەدا ئینگلیزەکان و سوپای سوارەو پیادەی میریو فرۆکە جۆراوجۆرەکانی ئینگلیز دریغی یان نەکردوو بەردەوام سەنگەری شۆرشگیرەکانیان بوردومان دەکردو دوای شەریکی سەخت لەشکری کورد کشانەوەو لەرۆژی ٢١ی نیسانی ١٩٢١ شیخ مەحموود گەیشتەوە ئیران و شەوی ٢٢لەسەر ٢٣چووە پیران و دووبارەکردی یەوە بەبنکەی خۆی.

دیارە ئینگلیزەکان و مەلیك فەیسەل بەباشی لەوە ئاگادار بوون کەدزلی و بانەیی یەکانی رۆژهەلاتی کوردستان پشت و پەنای بزوتنەوەکەی شیخی نەمرن بۆیە هەولیاندا کەلەگەل (رەزاشا)دا ریك بکەون و بەهەردوولا دژی شیخ مەحموودو مەحموود خانی دزلی بجەنگن و تەنانەت مەلیك فەیسەل داوای کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەل ئیرانی یەکاندا دانیشتن و ئەوانیش رازی بوون، بەم جۆرە ئیرانیش کەوتە دژایەتی شیخ مەحموودو ئەم جارەیان نەی ویست دالدەی بدات، راپۆرتی سالی١٩٢١ی ئینگلیزەکان کەداویانە بەکۆمەلەی نەتەوەکان بەم جۆرە باسی -ئاوباریك دەکات:

(کوردەکان ئازایانە جەنگین، هەرچەندە هیرش فرۆکەو پیادە بەردەوام بوو، بەلام ئەوان تاتاریك داهات بەرگری یان کردو ئینجا کشانەوە)[88] و هەروەها (دانەرانی راپۆرتەکە بی پیچ و پەنا باسی ئەوەیان نووسیوە کەچۆن فرۆکەکانی ئینگلیز لەماوەی دووهەفتەی داهاتوودا تاقیبی شیخیان کردووەو دەستیان لەهەلنەگرتووە تارۆژی ٢٠ی نیسان کردو یانە بەودیودا)[89].

دوای کۆبوونەوەی مەلیك فەیسەل و حوکومەتی ئیران و هاریکاری ئینگلیزەکان دژی بزوتنەوەی کورد، (رۆژی٥ی مایسی ١٩٢١سەرکردەی هیزی پیادە شەرکەرەکانی میری لەکوردستان زەعیم خەلیل زەکی بەیاوەری ئەفسەری بەریتانی-رۆبرتس- کەراویژکاری بوو بەفرۆکەی تایبەتی خودی مەلیك فەیسەل چوونە مەریوان و لەوی لەگەل سەرهەنگ- مەحموود خانی ئەمین- کۆبوونەوە)[90] و لەوکۆبوونەوەیەدا ئیمزای هاریکاری سەربازی هەردوولا کرا.

(رۆژنامەی-*تایمس*-ی لەندەنی لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێ:

هێزە سەربازییەکانی ئێران لەگوندی پیرانی سەرسنوور کەشێخ مەحموود پەنای بردبووە بەرخۆیان ئامادەکردو رایان گەیاند کەسوورن لەسەر ئەوەی رۆژی چواردەی مایس شێخ لەخاکی ئێران وەدەرنێن، هەمان کات لەم دیو سنوورەوە هێزە چەکدارەکانی عیراقیش خۆیان بۆ هێرشێکی هاوکات ئامادەکرد تاپەلاماری شێخ بدەن ئەگەر هاتوو سنوری بەزاند، رۆژی سیازدەی مایس هەردوو لاخۆیان بۆ هێرشی هاوبەشی رۆژی داهاتوو ئامادە دەکرد)[٩١].

رۆژی ١٢ی مایسی ١٩٣١شێخ مەحموود بریاری وەستاندنی بزوتنەوەکەیداو هەرئەوشەوەیش هاتە ناوخاکی عیراقەوەودوای گفتوگۆ لەگەڵ کاپتن *(ڤیڤیان مۆلت)* کەسیر فرانسیس هەمفریزی نوینەری باڵا بەناوی خۆیەوە ناردبوی شێخ خۆی دابەدەستەوە.

راپۆرتی سالی ١٩٣١ی ئینگلیزەکان باس لەوەدەکات کەچۆن ئینگلیزەکان دوای هاتنەوەی شێخ مەحموود لەسەر داوای رەزا شا هێزی تایبەتییان کردووەتە سەر مەحموود خانی دزلیو دەست بەرداری نەبوون تارۆژی ٢١ی مایسی١٩٣١بەدیلی گرتویانەو رەوانەی بەغدایان کردووە.[٩٢]

بەم جۆرە کۆتایی بەزنجیرەی شۆرشی شێخ مەحموودی مەلیك هات ئەوشێخەی کەبەدرێژایی ژیانی نمونەی خەباتو کۆشش و کۆڵنەدان بوو، ئەوشۆرشەی کەچەندین قارەمانی وەك مەحموودخانی دزلی و کەریم بەگی هەمەوەندو سابیری کوری و سەید محەمەدی جەباریو شیخ عەلی قەڵبەزەو زۆریتریش رەنجی فەرهادانەیانداو بوونە سەرمەشقی ریبازی کوردایەتیو کاری شۆرشگێرانە، بۆیەلەبنەتای ئەم بەشەدا بەپیویستی دەزانم کەبیرورای کاپتن ڤیڤیان تۆمار بکەم کەکاربەدەستیکی بەتواناو ئاگاداربووەو کوردییەکی چاکی زانیوەو بەناوی نوینەری بالاوە لەپێنجوین گفتوگۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا کردو بۆ رۆژی دوایی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە سلێمانیو لەوێوە بردی

بۆ بەغداد، ڤیڤیان هۆلت دوای دامرکاندنەوەی راپەرینەکەی شێخ مەحمود راپۆرتێکی نهێنی دەربارەی ئەو راپەرینەو گفتوگۆی خۆی لەگەڵ شێخداو گواستنەوەی بۆ سلێمانیو لەوێوە بۆ باشووری وڵات داناوە، لەو راپۆرتە بایەخدارەیدا هۆلت نووسیوییە دەڵێت:

*(شێخ مەحمود ئازایانە، خاوینو مەردانە دەجەنگی، دۆراندن لە شەردا ناوی لە ناو کوردی باشووردا نەزراند، دوای ئەوەی لە پێنجوین خۆی دا بەدەستەوەو بە دەستبەسەری گواستمانەوە، کوردی گوندەکانی دامێنی چیاکان بە لیشاو بە سەریا دەرژان، بە پەرۆشەوە دەستیان ماچ دەکرد، باسی دلرەقی دەکەن، بەڵام کێ شایەتە؟ لە ناو لادێییەکاندا شایەتییەکی وانییە، ئەوان لە کاتی بەزینیدا پاڵپەستۆیان بوو تا فریاکەون دەستی ماچ کەن، شایەتییەکی وا لە ناو فرکەوانەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکیشدا کە دژی جەنگین چنگ ناکەوێ، ئەوانیان لای شێخ دیل بوون، ئەوانیش هەموویان بە دڵ دەیانویست لەو کاتی شکستییەیدا دڵنەوایی بکەن، کەس لاری لەوە نییە- شێخ طەموحو خاوەن کیبریا بوو- بەڵام هەردوکیان بۆ نەتەوەکەی بوون، نەک تەنیابۆ خۆی. زۆر کەسی تریش وەک ئەو طەموحو خاوەن کیبریا بوونو ئەوەیان پی‌شەرم نەبوو. با نازناوی چەتەو یاخیگەری لە ئاستی یاسادا پێببەخشین، ئەی گاریبالدیو مستەفا کەمالیش وەک ئەو نەبوون، خۆگەر بیتو هەردوو لایەنی مەسەلەکە بەرچاوبگرین ئەوساکە دروسترین حوکم بە سەریا ئەوەیە کە گەورەترین هەڵەی شێخ بریتی بوو لەوەی سەدەیەک درەنگتر لەوەی دەبوو لە دایک بوو)* [٤٢]

سەرەتای ئەم بەشەمان ناونا رۆژە ئاڵۆزەکانی دوای جەنگی دەربەندی بازیان دیارە بە خۆڕایی ئەم ناونیشانەمان بۆ دانەناوە، چونکەئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان شکستی دەربەندی بازیانو کۆتایی ژیانی سیاسی شێخی نەمر سەردەمێکی ئیجگار جەنجاڵەو ئێمەیش تەنیا توانیومانە کە بە نووکە

### سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی شەشەم:

١-مەحموود خانی دزلیو مەحموود خانی کانیسانان هەردووکیان وەك دوو سەرداری دڵسۆز پشتو پەنای شێخی نەمر بوون، هەرچەندە (خانی کانیسانان) کەمتر لە بزووتنەوەکانی شێخی نەمردا بەشداریکردووە، بەلام لە کاتی ئاوارەبوونی خێزانو کەسو کارو لایەنگرانی شێخ مەحموودا هەردووکیان بەوپەڕی جوانمەردییەوە دەستی بالایان بووە لە پێشوازیو حەوانەوەی ئاوارەکانو گوێیان نەداوەتە چاوسوورکردنەوەی داگیرکارانو هەموو پێویستییەکیان بۆ دابین کردوونو لەلاپەرەکانی دواتردا بەشێکی تایبەتیمان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە.

٢-کە هەردوو خان بە بەند کراوی بەرەو تاران بەریدەکرێنو لەگەڵیاندا دەکۆڵنەوە، مەحموود خانی کانی سانان کە مرۆڤێکی خوێندەوارو بە ئاگا بووە دەڵێ:

من هیچم نەکردووەو هەر شتێکم کردبێ لە سەر فەرمانو داوای مەحموود خانی دزلی کردووەمو کاری ئەوم ڕاپەڕاندووە، (خانی دزلی) یش دەڵێ: بەڵێ ڕاست دەکات، پاش ماوەیەك خانی کانی سانان ئازاد دەکرێتو خانی دزلی دەنێررێت بۆ هیندستانو تا ئەیلولی ١٩٢١ بە بەندکراوی دەمێنێتەوە.

٣-دیوانی حەمدی -ئەحمەد بەگی ساحیب قران- چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٥٧،ل٤٠، چاپی یەکەم، بە پێشەکی دکتۆر مارف خەزنەدارو سەرپەرشتی نووسەرو ڕۆژنامەنووسی چالاك جەمال خەزنەدار.

٤-ئەحمەد خواجا، چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغداد، ١٦٨، ل٦٥.

٥-عادلە خانم ساڵی ١٨٥٩ لە دایك بووەو هاوسەری (عوسمان پاشای جاف) بووە، لە دوای کۆچی پاشای هاوسەری ساڵی ١٩٠٩ سەرۆکایەتی عەشیرەتو بنەماڵەی -جاف- دەگرێتە دەست، ساڵی ١٩١٩ لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا داگیرکارانی ئینگلیز مەدالیای (خان بەهادور) یان پێ بەخشی لە پاداشتیئەوەی کە یارمەتییەکی زۆری سوپاو کاربەدەستانی ئینگلیزی داوە دژی قارەمانی کوردستان شێخ مەحموودی حەفیدزادە. ساڵی ١٩٢٤ کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی (عەبابەیلی) بە خاك سپێرراوە. (بۆ زیاتر تێگەیشتن سەبارەت بەم هاوکارییە بڕوانە: العشائر الکردیە، ترجمەو علق علیە فؤاد حمەخورشید، مطبعة الحوادث،بغداد، ١٩٧٩،ص ٧٧،٧٨)

٦-الدكتور كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بغداد،١٩٧٨، ص١٤٥.

٧-رۆژنامەی پێشکەوتن، ژ٢٤، رۆژی ٧ی ئۆکتۆبەری سالی ١٩٢٠.

٨-سەرچاوەی پێشوو،هەمان ژمارە.

٩-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٤، ل١٦٦.

لەلایەکی ترەوە بۆ تێگەیشتنی زیاتر سەبارەت بە باروودۆخ و سەرهەڵدانی راپەڕینەکە بروانە:

مكرم الطالباني، ابرهيم خان ثائر من كردستان، بغداد، ١٩٧١.

١٠-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧. دکتۆریش بۆ ئەم مەبەستە سوودی لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە:

عبدالرزاق الحسني، الثورة العراقية الكبرى، صيدا- بيروت، ١٩٥٢، ص ١٧٠.

١١-رۆژنامەی (پێشکەوتن) ی ژ (٢٤) ی رۆژی ١٩٢٠/١٠/٧ لەم بارەیەوە دەڵێ:

لە ١٩٢٠/٩/٢٩ دا ئەو ئاوایییانەی کە لە قەزای -کفری- دابوون سووتێنران و کوێخاکانیان یان گیران یان رایان کردە ناو عەشایەری -عزە-

١٢-مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف لە مانگی شەیلولی ١٩٨٢دا سەردانی مالی (شێخ مەحموودی کوری شیخ فەرەجی بانی بنۆك)ی لە سەید سادق کردووەو دەڵێ: (شێخ فەرەج مرۆڤێکی ئازاو بوێرو کوردپەروەر بووە، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە بەرەی پێنجوین و بانەو سەقزدا شەڕی رووسی کردووە، هێندێك لەو شتانەی کە لە شەڕی -بنارەسوورتە-دا لە رووسەکانی گرتبوو هیشتا لای ئەم بنەماڵەیە ماون و بەرچاومان کەوتن، شێخ فەرەج متمانەپێکراوی شێخ مەحموود بوو، بۆیە بەشێك لە شتە نهێنییەکانی خۆی لای دادەنا.ئەو دەمەی کە شێخ لە هیندستان بوو ئەم لە دێی بانی بنۆك دا بە شاخی -رەنگینە-وە شەڕێکی لەگەڵ ئینگلیزەکان دا کردووە، مێژوو نووس ئەحمەد خواجا کە ماوەیەك -کاتب-ی شێخی گەورە بووە بۆی گێڕامەوە: من لە مالێ جەمال عیرفان بووم کەشەوێ شێخ فەرەج هات و فیشەکی لێ وەرگرت و چوو شەر لەگەل ئینگلیزەکاندا بکات، ئێمە زستانی ئەوساڵە کردو کۆششی ئەوەمان بوو کە بزووتنەوەیەکی چەکدار لە دژی ئینگلیزەکان ساز بکەین، هەم شێخ بگەڕێتەوەو هەم ئەو گفت و بەڵێنانەی پێیان دابووین جێبەجێیان بکەن)

مامۆستا ئەحمەد خواجا لە ل ٧٩ی بەرگی یەکەمی کتیبەکەیدا-چیم دی-نموونەی نامەیەکی -شیخ فەرەج- ی بۆ میجەر (سۆن) هیناوەتەوە. بۆ ئەم سەرچاوەیە بڕوانە : عەبدولرەقیب یوسف، بانگەوازێك بۆ روناکبیرانی کورد، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی ل١١-١٢.

١٣-(بۆ ئەم زانیارییانە بڕوانە: عەبدولرەقیب یوسف، سەرچاوەی پیشوو، ل ٤٤-٤٥.

١٤-رۆژنامەی (پێشکەوتن) ی ژ ٦٩ی ١٩٢١/٨/١٨ سەبارەت بەو شەرانە دواوە.

١٥-هەر لەم بەشەدا زیاتر لە جمووجوولەکانی کەریم بەگی هەمەوەند دەدوێین و بە بەلگەوە تیشکیان دەخەینە سەر.

١٦-میستەر (ئەدمۆندز) لە ٢٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٩دا لە شاری (ئۆساکە) ی وڵاتی ژاپۆن لە دایك بووە، چونکە لەو کاتەدا باوکی بە ئیش و کاری وڵاتەکەی لە ژاپۆن بووە، ئەدمۆندز لە ژیانیدا چەندین شارو وڵات و کوچەی ئەم دنیایە گەڕاوەو بۆخزمەتی وڵاتەکەی کاری کردووە. ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ سوپای بەریتانیادا هاتووەتە سلێمانی، ئەدمۆندز یەکێکە لە دوژمنە دێرینەکانی کوردو بۆ چاکەی وڵاتەکەی خۆی هەولێکی فرەی داوە، لەگەڵ ئەوەیشدا لە بواری نووسینی مێژوویی و ئەدەبی و شوێنەواری و زمانەوانی کوردەوە رەنج و کۆششی دیارە، کۆنترین کردەوەی زانستی ئەدمۆندز ئەو دوو بابەتەیە کە بە زمانی ئینگلیزی ساڵی ١٩٢٥ بڵاوی کردووەتەوەو یەکەمیان بریتییە لە بیبلیۆگرافیای رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان تا ساڵی ١٩٢٥، دووەمیان بابەتی (دوو شاخی کۆن لە باشووری کوردستان). لە ساڵی ١٩٢٨دا وتاریکی تری بە ناونیشانی (دوو شاخی هەرە کۆن لە باشووری کوردستان) . لە ساڵی ١٩٣١دا وتاری (هەوڵدان بۆ نووسینی کوردی بە لاتینی) بڵاوکردووەتەوە، ساڵی ١٩٣٣ یش بابەتیکی بە ناونیشانی (تێبینی لە بابەت بە کارهێنانی لاتینی لە زمانی کوردیدا) خستە بەرچاو، ئەمە جگە لە کتێبی (کوردو تورك و عەرەب) کە ساڵی ١٩٥٧ لە لەندەن بە چاپی گەیاندو لە گەڵ لایەنەوە پەیوەندی بە مێژووی کوردەوە هەیەو سەرچاوەیەکی دانسقەیە، ساڵانی ١٩٥٨،١٩٥٩ چەند بابەتیکی تری سەبارەت بە کورد خستووەتە بەر چاو. بە هاوکاری زانای کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی فەرهەنگی (کوردی-ئینگلیزی) لە ساڵی ١٩٦٦دا خستە کتێبخانەکانەوە.

ئەدمۆندز ساڵی ١٩٤٥ وڵاتی عیراقی بەجێهێشت و گەرایەوە بەریتانیا، (بۆ زیاتر تیگەیشتن لە میژووی ژیانی ئەدمۆندز بڕوانە: گۆڤاری دەنگی گیتی تازە، ژ٢ بەرگی ٤ مایسی ١٩٤٥ کە لەو ژمارەیەدا وینەیەکی ئەدمۆندز بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بڕوانە دکتۆر

مارف خەزنەدار، رۆژنامەی هاوکاری، بابەتی تۆفیق وەهبیو ئەدمۆندز، ژ ١١٨٥ رۆژی ١٩٩٠/٦/١١.

١٧-ادموندز، کرد وترك وعرب، ترجمە جرجیس فتح‌الله، مطبعة التایمس، بغداد، ١٩٧١، ص ١١٢،١١٣

١٨-محەمەد رەسول هاوار، شیخ مەحموودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی لەندەن،١٩٩١، ل٢٢٠- ٢٢١

١٩-هەمان سەرچاوەو لاپەرە

٢٠-هەمان سەرچاوە، ل٢٢٢

لە لایەکی ترەوە سەبارەت بە هەڵاتنی ئەحمەد بەگی ریشێن کە ساڵی ١٩٢٧ کۆچی دوایی کردووەو یەکێك بووە لە دۆستو لایەنگرە دلسۆزەکانی مەحموود خانی دزڵی، رەفیق حیلمی دەڵێ:

(ئەحمەد بەگی ریشێن کە یەکیك لە گەورەکانی جاف بوو، بە هۆی هاندانی کورانی - وەسمان پاشای جاف- ەوە گیرابوو، لە سلیمانی خرابووە ژێر چاودیری حوکومەتەوە، ئەویش لەو رۆژانەدا لە سلێمانی هەڵاتو چووە لای -جەعفەر سولتان- ی خزمی کە رەئیسی هەورامان بوو، حوکومەت مەفرەزەیکی ناردە سەری کە بیگرنو تووشی بوون، بەڵام مەحموود خان باش قەڵاچۆی کردبوون، هەورامانیش چەند جارێك هێزی هەوایی چووە سەریان بەڵام کەڵکی نەبوو، لەم پەلاماردانەدا نزیکەی حەوت یان هەشت کەوتن یان خرانە خوارەوە.)

بۆ ئەمەیش بروانە -رەفیق حیلمی- یادداشت، بەشی سێیەم، چاپخانەی دار الحریة للطباعة، بەغداد، ١٩٩٢، ل ١٣ (ئەم بەشەیان دکتۆر پاکیزەی کچی بە چاپی‌گەیاندووە.)

٢١-محەمەد رەسول هاوار، هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٢، ٢٦٣

٢٢-Report on Iraq administration, October, 920-922,London, 1923, P.123 هەروەها:

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، گۆڤاری کاروان ژ١٧، شوباتی ١٩٨٤

هەروەها:

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٤، ل ١١٧، ١١٨

٢٣-البرت نتشاشفیلی، العراق فی سنوات الانتداب البریطانی، ترجمە الدکتور، هاشم صالح التکریتی، مطبعة جامعه بغداد، ١٩٨٧،ص٣١٧

٢٤-کاپتن بۆند-bond ئەو ئەفسەرە بوو کە شێخ مەحموودی بردە بەردەم دادگای عورفی بەریتانی لە دوای بریندارکردن و بەدیلگرتنی لە شەڕی دەربەندی بازیانی ڕۆژی ١٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩دا.

٢٥-ئۆزدەمیر پاشا: ئەفسەرێکی گەورەو لێهاتووی تورک و لایەنگری مستەفا کەمال بوو، ئۆزدەمیر نازناوی بوو، ئەگینا خۆی ناوی عەلی شەفیق و بە ڕەگەز میسری بوو، لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢دا کەمالییەکان لەگەڵ هێزێکی سەربازیدا ناردیانە ڕەواندوز، ئۆزدەمیر توانی لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەردارانی کورد دابمەزرێنی، هەزارو یەک گفتی شیرین و درۆی دانی، چالاکییەکانی ئۆزدەمیرو هاریکاری لەگەڵ سەردارانی کورددا بە تایبەتی لەگەڵ شێخ مەحمووددا تەواو ئینگلیزیان بێزار کردبوو، پاش ماوەیەک ئۆزدەمیر ناچاربوو بکشێتەوە، هەرچەندە لە بارودۆخی ئەو ڕۆژگارەدا کەمالییەکان بە پاکی لەگەڵ کورددا بهاتنایە پێشەوە دەیان توانی جێ پێی ئینگلیز تەواو شلۆق بکەن. (بۆ ئەم پەراوێزە بڕوانە:

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی کورد، بە شی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٤، ل١٢٠)

٢٦-ڕۆژنامەی پێشکەوتن، ژ ١١٢ی ڕۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣

هەروەها بۆ ئەم هەواڵی بەخشش و گرتنە بڕوانە: دۆکیومێنتی ژ No. 831-C.O.22 ڕۆژی ١٩٢٢/٦/٢٣

٢٧-پێشکەوتن، ژ١١٧، ڕۆژی ٢٠ی تەمموزی ١٩٢٢، لاپەڕەی یەکەم

٢٨-محەمەد ڕەسوڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی لەندەن، ١٩٩١، ل٢٢٦

٢٩-سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٥

٣٠-هەمان سەرچاوە، ل٢٣٦

٣١-هەمان سەرچاوە، ل٢٣٩

محەمەد ڕەسوڵ هاوار دەڵێ: دەسەڵاتدارانی وێنە ڕەنگە مەبەستی حەمە ڕەشید خانی بانە بێ

.32-Report on Iraq administration, October 1920-1922,London,1923.

٣٣-کتێبی (تاریخ الکویت السیاسی) بەشی یەکەمی، بەرگی پێنجەم، لە دانانی (حسین خلف الشیخ خزعل) کە سالی ١٩٧٠ لە بیروت چاپکراوە. ٥٤ لاپەرەی سەبارەت بە کوردو هاتنەوەی شێخ مەحموودەوەیە بۆ کویت، (هاتنەوەی شیخ مەحموود بەرزنجی بۆ کویت) سەرناوی ئەوە بەشەی کتێبەکەیەو نووسەر بە راستگۆیی سەبارەت بەم هاتنەوەیە گەلێ شتی نادیاری باس کردووە. دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سالی ١٩٩٠ بە ناونیشانی لە نێوان شیخ مەحموودو ئەمیری کویتدا کورتەیەکی کتێبەکەی باس کردووە، بۆ ئەمەش بروانە:

هاوکاری ژ ١١٨٠ رۆژی ١٩٩٠/٥/٢٤

٣٤-بروانە: بانگی کوردستان، ژ٧،س١، هەینی، ٢٢ی ئەیلولی ١٩٢٢

٣٥-بانگی کوردستان ژ٦، س١، دووشەممە، ١٨ی ئەیلولی ١٩٢٢

٣٦-دیوانی حەمدی- ئەحمەد بەگی ساحیبقران، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٥٧، ل ١٤٧

٣٧-بانگی کوردستان، ژ٦، س١، دووشەممە، ١٨ی ئەیلوولی ١٩٢٢

٣٨-بانگی کوردستان، ژ٧، س١، هەینی، ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٢٢

٣٩-فەوزی نازناوی خوالێخۆشبوو (شیخ ئەحمەدی حاجی شیخ غەنی) بەرزنجی‌یە، سالی ١٣١٠ی کۆچی لەسلێمانی لە دایك بووە، ژیانی بە مورچەخۆری بە سەر بردووە، گەلێ لە بەرهەمەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی رۆژگاری شێخی نەمردا بلاوکراونەتەوە، مامی شاعیری ناودار خوالێخۆشبوو (شێخ نووری شیخ سالح) ە رۆژی ٩ی شوباتی سالی ١٩٥٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووەو دیوانی شیعرەکانی پەرت و بلاون و چاپ نەکراون

٤٠-بانگیکوردستان، ژ٨ س١، هەینی، ٢٩ی ئەیلولی ١٩٢٢

٤١-بۆ فەرمانی ژ(١)ی حوکمداری کوردستان بروانە: رۆژنامەی بانگی کوردستان، ژ١٠ س١، یەك شەممە، ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢

٤٢-بۆ تەشکیلاتی حوکومەتی کوردستان و ناوەکانیان بروانە سەرچاوەی پێشوو هەمان ژمارە

٤٣-بۆ فەرمانەکانی حوکمداری کوردستان بروانە بانگی کوردستان، لە ژ(١٠)و بەرەوژووروتر

٤٤-بانگی کوردستان، ژ١١،هەینی، ٢٠ی تشرینی یەکەمی١٩٢٢

٤٥-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥

٤٦-کەمال ڕەئوف محەمەد، گۆڤاری ڕامان، ژ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩

٤٧-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨، ل ٨٤

٤٨-لە کاتێکدا هێزەکانی ئینگلیز چوونە ناو ئەشکەوتی جاسەنە (ئەدمۆندز ١٨٨٩/١١/٢٦-١٩٧٩) ی ڕاوێژکارو ئەفسەرو سیاسی بەناوبانگی ئەو سەردەمەیان لەگەڵدا بووە، وەك کەسێکی خوێندەوار دەربەستی مەسەلەی ڕووناکبیریو مێژووی ڕۆژنامەنووسی ناوچەکە هەر سێ ژمارەکەی ئەم ڕۆژنامەیەی دەستگیر دەبێو دەیانپارێزێو ساڵی ١٩٢٥ لێکۆڵینەوەیەکی بەپیتی بە زمانی ئینگلیزی سەبارەت بەم ڕۆژنامەیەو ڕۆژنامەکانی تری سەردەمی شێخی ئەمر بڵاو دەکاتەوە.

ئەدمۆندز یەکەم کەسە کە زانیاری دروستی سەبارەت بە ڕۆژنامەی بانگی حەق بڵاوکردووەتەوەو تەنانەت یەکەم کەسیشە کە ژ (٢)ی دەستنووسی پاراستبێو لە فەتاندن ڕزگاری کردبێ.

٤٩-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨، ل ٨٤، ٨٥

٥٠-لە کاتێکدا شێخی ئەمر گەڕایەوە تەنیا یەك ژمارەی بانگی کوردستانی دەرکردبو لە ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٢٠ دا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەیەکی نوێی بە ناوی (ئومێدی ئیستیقلال) ەوە کەوتە بەر چاوی خوێندەواران و کۆمەڵی نووسەری چاکی وەك حسین ناظم و ڕەفیق حیلمی بەڕێوەیان دەبرد.

٥١-ادموندز، کرد وترك وعرب، ترجمە جرجيس فتح‌الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧٢، ص ١١٢، ١١٣

٥٢-یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی ژیانەوە ڕۆژی (١٨) ی ئابی ١٩٢٤ بڵاوکرایەوەو ٥٦ ژمارەی لێ دەرچوو.

٥٣-لە ڕۆژی ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ دا یەکەم ژمارەی (ژیان) بڵاوکرایەوە.

٥٤-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٦، ساڵی ١٩٩٥

٥٥-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥

٥٦-دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، التسلسل: 13/1/30 الوثيقة رقم ٢، ص ٦ بيان عن المقررات التي بت فيها المؤتمر المعقود في كركوك في ٢ ايار ١٩٢٥.

سەرچاوەی ئەم بەڵگەنامەیە بابەتێکی مێژوویی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەدە، بۆ ئەمەیش بڕوانە، ڕۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥

٥٧-هەمان سەرچاوەی پێشوو

٥٨-هەمان سەرچاوەی پێشوو

٥٩-دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية، البلاط الملكي، التسلسل 311/2462 الوثيقة رقم ٤٦، ص ٥٨، قرارات مجلس الوزراء/ سري، ترجمة الكتاب المرقم Bo/122 في حزيران ١٩٢٥ المرسل من مستشار فخامة المعتمد السامي بالعراق الى سكرتير مجلس الوزراء.

٦٠-د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥

٦١-عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، الطبعة الثانية، الجزء الثاني، صيدا- لبنان، ١٩٥٧، ص ٢٦٨-٢٦٩

هەروەها :

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٢٥، ئازاری ١٩٩٥

٦٢-مەبەست سابیر بەگی کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندە

٦٣-مەبەست بەهیێ خانی عەتاری هاوسەری شێخ مەحموودو دایکی شێخ رەوف و شێخ باباعەلی و حەلاوەخانە.

٦٤-مەبەست ئایشە خانی شێخ مارفی نەقیبی هاوسەری شێخ مەحموودو دایکی شێخ لەتیفە، ئایشە خان خوشکی گەورەی حەپسە خانی نەقیبی بەناوبانگە کە هاوسەری شێخ قادری برا بچووکی شێخ مەحموود بوو.

٦٥-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، ژ ١٢٥، ئازاری ١٩٩٥.

هەروەها بڕوانە:

Public Record Office, Air, 23/198-part 10,X/M04583, From Penjwin to aviation, No. M/CH/73,7th July, 1925, P. 100

٦٦-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ١٢٦، سالی ١٩٩٥

٦٧-دکتۆریش ئەم زانیارییانەی لە چەند بەڵگەیەکی ئینگلیزەکانەوە وەرگرتووە.

٦٨-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٢٦، سالی ١٩٩٥

٦٩-ژمارەی فڕۆکەکان لە بەڵگەنامەکەدا باش دەرنەچووە، لەوانەیە سێ بێ نەك پێنج

٧٠-P.R.O. Air 23/207, part 18,X/m4583,To Aviation and Aeroone, From aeroone Sulaimani, prefix D, Ref. ,P.A/470, Date26,9,1925

٧١-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٢٥، ئازاری، ١٩٩٥، هەروەها بروانە:

Public Record Office. AIR, 23/195-part 7, X/M/04583, From Special Sulaimani to Aviation Baghdad, No, M/282,5th June, 1925, .P. 55

٧٢-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٢٥، ئازاری ١٩٩٥

Ibid,23/198- part 10,X/M/04583,From Special Choartah to Aviation Adm. Sul.,No.M/CH52, 27th June, 1925,P.3.

٧٣-محەمەد رەسوڵ هاوار،شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی لەندەن، ١٩٩١،ل ٥٦٥

٧٤-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨٠، ٥٨١

٧٥-هەمان سەرچاوە، ل٥٨١، ٥٨٣

٧٦-هەمان سەرچاوە، ل ٥٨٣، ٥٨٤

٧٧-هەمان سەرچاوە، ل ٥٨٤، ٥٨٦

٧٨-(Report His Britanic Majesty's Government to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1927), London, 1928

٧٩-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕێك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل١٢٢ (راپۆرتی پەراویزی پێشوو هەر لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە.

٨٠-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨١-ئەم شیعرەی شێخ سەلام کە بە ناونیشانی (بۆ کۆمەلی ئەقوام-عصبە الامم) دایناوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٩٣١و بۆ یەکەمجار لە ژ٢٣ی سالی دووەمی رۆژی یەکی تەمموزی سالی ١٩٣٣ی گۆڤاری (هاوار) ی سووریادا بلاوکراوەتەوەو دواتر خراوەتە دیوانەکەیەوە، بۆ ئەمەیش بروانە: دیوانی شیخ سەلام، چاپی یەکەم چاپخانەی تەمەدون، بەغداد، ١٩٥٨، ل١-٤ ، بەپێشەکی د.مارف خەزنەدارو سەرپەرشتی نووسەرو رۆژنامەنووسی چالاك جەمال خەزنەدار.

٨٢-مەبەست (ئارثر هیندرسن) • A.Henderson (١٨٦٣-١٩٣٥) کە لە سالی (١٩١١)ەوە تاکوو سالی ١٩٣٤ سکرتێری پارتی کریکاران بوو، سالی ١٩٢٩ بوو بە وەزیری

دەرەوەو ساڵی ١٩٣١ وازیهێنا، ئەو کاتەی شێخ سەلام شیعرەکەی وتووە، هیندرسن وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو.

٨٣-ئەو دێرانەی لێرەدا نووسراونەتەوە هەموو شیعرەکە نییە بەڵکو چەند دێرێکمان لێ هەڵبژاردووە.

٨٤-عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، ص ٧٤

هەروەها بڕوانە:

محەمەد رەسوڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی لەندەن، ١٩٩١، ل ٧٥٤-٧٥٥

٨٥-بڕوانە دیوانی سەلام، شێخ سەلام لەم دیوانەدا مێژووی ژیانی بە قەڵەمی خۆی نووسیوەتەوە، چاپخانەی تەمەدون، بەغداد، ١٩٥٨، ل١-٤. چاپی یەکەم.

٨٦-P.R.O., C.O.,730,163/88069,part 11,X/M 08533, 1931,Iraq, Shaikh Mahmud,Report.by the Air Officer Commanding Iraq Command on the operations in southern Kurdistan against Shaikh Mahmudfrom October, 1930-May, 1931,P.15

٨٧-الحكومة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية الثالثة، الجلسة الثامنة والاربعون، المنعقدة صباح يوم السبت المصادف ٢٨ اذار سنة ١٩٣١، بغداد، بلا ، ص٦٧٣

هەروەها بڕوانە:

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٦، ساڵی ١٩٩٥. ئەوەی شایانی وتنە کە ئەو زانیاریانەی ئەم پەراوێزە لەو باسەی دکتۆر کەمالەوە وەرگیراوە. لە لایەکی ترەوە دکتۆر کەمال دەڵێ (سەعد سالح نیشتمانپەروەرێکی هیوەر بوو. تەنیا لە مەسەلەی کورددا توندرەو بوو، ئەوسا کە نوێنەری دیوانیە بوو، شوباتی ساڵی ١٩٤٦ لە دووەم کابینەی تۆفیق سویدیدابوو بە وەزیری کاروباری ناوخۆ.

٨٨-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل١٢٣

٨٩- هەمان سەرچاوە

٩٠-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ ١٣٦، ساڵی ١٩٩٥

٩١-The Times,London,May 21,1931

هەروەها بڕوانە:

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژ١٣٦،سالی ١٩٩٥

٩٢-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەل کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل ١٢٢

هەروەها بڕوانە ڕاپۆرتەکە:

Report by His Majest'y Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the Year 1931/ P.P.16-17

٩٣-P.R.O.,C.O.,730 163/88069,X/M 08533,1931,Shaikh Mahmud, part 11, Appenaix A,Biographical, Note on Shaikh Mahud by Captain V.Holt

٩٤-دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، هاوکاری، ڕۆژنامە، ژ ١١٨٠، ڕۆژی ٢٤/ ٥/ ١٩٩٠

* * *

بەشی حەوتەم

# خانی دزلّی و کەمالیەکان

# و

# نامەیەکی مێژوویی شێخ مەحموود

جەنگی یەکەمی جیهانی [1] بووە هۆی دروست بوونی بارودۆخیکی گرژو ئالۆزو رووداوەکانی لەمەودایەکی جەنجالّو بەیەکاچوودا دەخولانەوە، نەخشەی جیهان بەگشتیو رووبەری رۆژهەلاّتی ناوەراست بەتایبەتی رووبان کردە گۆرانو تەمی راپەرینو جموجولّیان لیّ نیشتبوو، لاوازبونو هەرەس هێنانی دەولّەتی عوسمانیو دەست بەسەراگرتنی ئینگلیزەکانو درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختو ژیانی سیاسی (مستەفا کەمال١٨٨١-١٩٣٨)و دروست بوونی تورکیای نوێو توت کردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسلّو ململانیی توندو پروپاگەندەی (کەمالیەکان)[2] و دەسەلاّتدارانی ئینگلیزو گەشەکردنی مەسەلەی کورد لە کوردستانی گەورەداوبرەوشۆرەتی شێخ مەحمودی حەفیدزادەی بەرزنجیو جۆشو خرۆشی کوردانی ناوچەکە، ئەمانە سەرجەم تابلۆی نەخشاوو ئالۆزکاوی ئەو رۆژگارەنو پێکەوە شەتەك درابوونو هەریەکەیان کاری لەوی تریان دەکردو لێك دانەدەبران.

لەسەرەتادا کەمالی‌یەکان (شۆڕشی ڕزگاری‌یان دژی حکومەتی سولتان و داگیرکاری بێگانە بەرپاکرد، ئەمەیش بارێکی سیاسی نوێی هێنایە کایەوە کەبەجارێك سەرتاپای وڵاتی گرتەوەو کارێکی گەورەشی کردە سەر ژیانی سیاسی میللەتی کوردو هەموو دوا ڕۆژی)[3] وەدەنگ و سەدای ئەم بزوتنەوە نوێیە (بەشێکی زۆری لە میللەتی کورد جوڵاند کە دڵسۆزانە چوونە پاڵپشتی بۆ ئازاد کردنی نیشتمانی هاوبەش لەداگیرکاری بێگانە.)[4]

لەو ڕۆژگارە تایبەتی‌یەدا کەمالی‌کانی تورکیا و ئینگلیزەکان لەپێناوی مەیسەر بوونی کاروبارو فراوان بوونی سنووری دەسەڵاتیان‌دا بەرنامەی پروپاگەندەی دارێژراویان دەخستە بەر دەست،خۆیان بەدڵسۆزو خەمخۆری کورد دەزانی و سەرزارەکی دەستیان بە داوێنی‌یەوە گرتبوو، هەریەکەیان لەیانویست بەگفتو بەڵێنی درۆ کوردو مەسەلەکەی بەلای خۆیدا رابکێشێت و گەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ لەخشتەیان بەرن.

بەواتایەکی ئاشکرا تر دەتوانین بڵێین کە (لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە تاکو بڕیاری کۆمەڵەی گەلان لەدیسەمبەری ١٩٢٥ دەربارەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ ئینگلیزو کەمالی‌یەکان هەوڵیان ئەدا کە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە خواست و ئاواتەکانی بزاڤی ڕزگاری خوازی گەلی کورد لەباکوورو باشووری کوردستان‌دا بۆ خزمەتی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەکاربهێنن)[5].

سەبارەت بەئامادەکردنی نەخشەو پلانی پروپاگەندەو هەوڵ و کۆششی تورکەکان لەم بوارەدا هەر لەسەرەتای کارەوە (مستەفا کەمال و هاوەڵەکانی زۆر بەئاسانی توانی‌یان جێ پێی خۆیان لەکوردستان‌دا بکەنەوە، چەند جارێك بچنە ناو کوردەکان و بەڵکو لەساڵی ١٩١٩شدا چەند کۆبوونەوەیەکی سیاسی گەورەی خۆشیان لەناو ئەواندا بگێڕن، ئەوەیش لەخۆیدا بەڵگەی ئەوەبوو کەهێزە دیموکراتی‌یەکانی کورد لەو باوەڕەدا بوون کەبەسەرکەوتنی کەمالی‌یەکان

کێشەی نەتەوایەتی ئەوانیش لەسەر ڕێو شوێنێکی ڕاست چارەسەر دەکرێت، ئەوەی زیاتریش پاڵی پێوە نان بۆ ئەم بیرە ئەو هەوڵو تەقەللاو پەیمانە زۆرە بوو کەکەمالی‌یەکان ئەیان دان بۆ نزیك کەوتنەوە لەکورد، بەتایبەتی چونکە ئەشیان زانی ئەوە ئەبێتە هۆیەکی یارمەتی‌دەر بۆ سەندنەوەی کوردستانی خواروویش کەیەکسەر لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کەوتنە کێشە، هەر لەبەر ئەمەیش بوو زۆر جار ئەو پەیمانانەی دەیان دا بەکورد لەشێوەی بەیاننامەی تایبەتی‌دا بڵاویان ئەکردنەوەو ئەشیان ناردنە ناوچەکانی کوردستانی خواروو، لەیەکێك لەو بەیاننامانەدا کە لە -ئاراتو چۆڵە مێرگ دا بلاوکراونەتەوەو چەند ژمارەیەکی گەیشتۆتە ڕەواندزیش ئەڵێت:

-ئەی هاونیشتمانی یان، حکومەتی کۆماری تورکی بەتەواوەتی سوورە لەسەر ئەوەی هەموو پێویستی‌یەکی شارستانێتی لە نیشتمانە خۆشەویستەکەمان کوردستانی تورکیادا بڵاو بکاتەوە، ڕێگاوبانەکانتان قیرتاو ئەکرێت، دێهاتو شارەکانتان بێ قوتابخانە نامێنێتەوە، خێزانەکانتان شادمانو بەختیار ئەبن، ئاسایشو یاسا دەبنە هۆی پەرەسەندنی خێرو خێراتی ولاتەکەتان، ژیانو ماڵو شەرەفی هاونیشتمانی‌یەکانمان لەژێر پاریزگاری ڕاستەقینەو دلسۆزانەی یاسای کۆماردایە).[٦]

دیارە ئەم بارو دۆخە هەروا بەسادەیی دروست نەبووەو هۆکاری تایبەتی لە ئارادابووە چونکە (لەگەرمەی سەرەتای شۆرشی بۆرژوازی تورکدا ژمارەیەکی زۆر لەو سەرۆکانەی لەگەڵ مستەفا کەمالدا ئەو شۆرشەیان بەرپاکردو هەروەك لەیادداشتو نامە کۆکراوەکانی خۆیدا دەردەکەوێت کورد بوون)[٧] و تەنانەت (کۆمیتەی سەرۆکایەتی کۆنگرەی-ئەرزروم-٢٢ی تەمووز-٦ی ئابی ١٩١٩-کە بەیەکێك لەخاڵە هەرەگرنگەکانی سەرەتای ئەم شۆرشە دادەنرێت لە ١٨ کەس پێکهاتبوو کەسیانیان کورد بوون)[٨].

نەك هەر ئەوەندەیش بەڵكو (لەشورای نیشتمانی گەورەی توركیادا كەماڵی یەكان لەنیسانی ساڵی ١٩٢٠داو لەشاری ئەنقەرە بەستیان ٧٢ نوێنەری كورد بەشداری كردووە)[٩] و تەنانەت (هەموو ئەندامانی ئەم شورایە زۆر بەگەرمی پێشوازی قسەكانی نوێنەری شاری-ئەرزروم-حەسەن عەونی یان كرد كەلەیەكێك لەكۆبوونەوەكانی دا وتی : لەم تریبونەوە -منصە- قسەكردن هی دوو نەتەوەیە كوردو توركو لەم جۆرە قسەیەش چەند جارێك لەلایەن نوێنەری توركەكانەوە لەكاتی كۆنگرەی قوستەنتەنی یەدا بۆ لێكۆڵینەوەی كێشەی موسڵ دووبارە كرایەوە)[١٠].

دیارە گرتنی ئەم رێچكەیەو چنینی فروفیڵو چاوبەستی بەردەوامی توركەكانو هەڵوێستی ژێر بەژێریان سەبارەت بەنەتەوەو ئاینو خەلافەت دەگەڕێتەوە بۆ چەند مەبەستێكی گرنگ وەك پاكتاو كردنو لەناو بردنی ناحەزانو بەكارهێنانی كورد لەم پێناوەداو سەرەرای ئەمەیش (كەماڵی یە بەهێزەكانی توركیا دەیان ویست ویلایەتی موسڵ بۆ خۆیان زەوت بكەن، لەناو كوردی باشووردا لەرقی ئینگلیز بەهۆی كورت بینی فەرمان رەوایانی ئەو رۆژگارەی عیراقەوە كەماڵی یەكان لایەنگریان كەم نەبوو).[١١]

ئاشكرایە لەبەر رستێك هۆی ئابووریو سیاسی كەماڵی یەكان چاویان بریبووە ویلایەتی موسڵو مەبەستیان بوو، مێژوو نووسی ئاگاداری ئینگلیز- ئارنۆلد تۆینی- دەڵێ كە (كەماڵی یەكان لەوە زارە ترەك بوو بوون كەبە بەشێك لەكوردی ئیمپراتۆری عوسمانی رووخاویان لەدەست بچێ چونكە لەگەڵ كوردا نیازیان پاك نەبوو.)[١٢] سەرەرای ئەمەیش (كەماڵی یەكان تینووی داهاتی چاوەڕوان كراوی نەوتی ویلایەتی موسڵو خێرو بێری زۆری تری بوون تا وڵاتەكەیان پێ ببوژێننەوە)[١٣] و بەم خواستو ئاواتەوە (بۆ دیاری كردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ دەنگی كورد بۆ هەردوو داواكاری- ئینگلیزو

کەمالیەکان- زۆر پێویست بوو، کەمالیەکان هەوڵیان دەداچەند دەتوانن هێند کەڵك لەسەر دڵرانی کورد وەربگرن، بەتایبەتی شیخ مەحمود کەئەویش دوای ئەوەی هیوای بەئینگلیز نەما بۆ چێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی لاری لە دامەزراندی جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کەمالیەکاندا نەبوو کە ئەو ساکە لای هەموو نیشتمان پەروەرانی جیهان خۆشەویست بوون، چونکە بەدوژمنی گەورەی ئینگلیز لەسەرجەم رۆژهەلاتی نزیكو ناوەراستدا دادەنران، جگە لەوە ئەو کوردانەی لەنێوان هەردوو لادا بوون وایان بردبووە مێشکی شیخ مەحمودەوە کە گوایە ئینگلیزەکان ئامادەن دەست لەویلایەتی موسڵ هەڵبگرن و کەمالیەکانیش لارییان لەوە نییە ئۆتۆنۆمی بدەنە کوردبەڵگەنامەیەکی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا باسی چالاکییەکانی ئەحمەد تەقی فەندی دەکاتو دەڵێ:

-ئەحمەد تەقی دەوروبەری حەوتی تشرینی سالی ١٩٢٢ لەئەنقەرەوە بەرێگەی ورمێدا گەراوەتەوە سلێمانیو لەوی رای گەیاندووە کەویلایەتی موسڵ بێ سێو دوو دەگەرێتەوە دەست تورکو حکومەتی بەریتانیا دەپارێتەوە بۆ ئەوەی تەنها هێلێ شەمەندەفەرو بەشێك لەنەوتی ئەو هەرێمەی پێ بدرێ، بەپێی هەمان بەڵگەنامە ئەحمەد تەقی فەندی وتویەتی کە فەرمانی ئۆتۆنۆمی پێیە بۆ شێخ مەحمود)[١٤].

دیارە ئەم هەموو پرو پاگەندەو درۆو دەلەسەیەی کەمالیەکان سەرجەم کاریان کردە سەر شێخ مەحمودی حەفید زادەو سمایل خانی سمکۆو مەحمود خانی دزڵیو چەند سەرەك ئێلێکی کوردو هەموویان کەمو زۆر پەیوەندیان لەگەڵ کەمالیەکاندا پەیدا کردو بۆ ئەم مەبەستەیش (ئۆزدەمیر)ی[١٥] بەناوبانگو (رەفیق حیلمی)[١٦] و (ئەحمەد تەقی)[١٧] و (غەفور خانی ناودەشت)[١٨] و (عەبدوڵلا ئاغای-کۆنە مودیر)[١٩] و (سیتۆ)[٢٠] ناوێکی خەڵکی

ئامێدیش دەوری کارایان لەئاسان کردنی پەیوەندیەکاندا هەبووەو لەم بوارەدا جێ دەستیان دیار بووە.[21]

بەڵام زۆری نەخایاند کەمالیەکان رووی راستەقینەی خۆیان کەوتە روو، دوای قایم کردنی جێ پێیان لەهەموو گفتو پەیمانێکیان پاشگەز بوونەوەو دەستیان بەخوێنی لاوەکانی کورد ئاڵ کردو کەسێکی وەك (زیاگیوك ئالب کەبەیەکیك لەفەیلەسوفە نەتەوە پەرستە هەرە گەورەکانی تورکیای نوێ دادەنرێت لەو رۆژنامەیەدا کەلەشاری دیار بەکر بەزمانی تورکی دەرئەچوو چەند وتاریکی بڵاوکردەوە دەربارەی ئەوەی گوایە دیار بەکرودانیشتوانی، بگرە دانیشتوانی هەموو شارەکانی کوردستانی باکور تورکن)[22] و بەبێ ئەوەی رەچاوی ئەو راستیە بکات کە (باکوری کوردستان مەڵبەندو لانکەی سەرەتای دروست بوون و گەشەکردنی بیرو باوەڕی نەتەوایەتی و بنکەی جولانەوەی ئازادی هەموو میللەتیکوردە و زۆربەی بزوتنەوە ئازادیخوازەکانی کورد لەسەدەی نۆزدەمینەوە لەم بەشەی کوردستانەوە سەری هەڵداوە، دروشمی سەربەخۆی کوردستانی گەورە لەکاتی راپەرینە مەزنەکەی شێخ عوبیدوڵڵادا بەرزکرایەوە، جگە لەمانەیش هەر کوردە دڵێرەکانی ئەم بەشەی کوردستان بوون کەیەکەم رۆژنامەیان بەزمانی کوردی بڵاوکردەوەو یەکەم رێکخراوی سیاسییان لەمێژووی هەموو کوردستاندا دامەزراند).[23]

ئاشکرایە کەسەرکوت کردنی بێ بەزەییانەی راپەرینەکەی (شیخ سەعیدی پیران)[24] و پەرەسەندنی زەبرو زەنگ و فشاری کەمالیەکان و رەفتارە ناچیزەکانیان (وتەکانی شاندەی تورکیای بۆ کۆنفرانسی لۆزان بەدرۆخستەوە کەدەیوت: کەمە نەتەوەییەکان بەچارەنووسی خۆیان لەسایەی رژێمی تورکیادا بەختەوەرن، سەرکوت کردنی بێ بەزەییانەی راپەرینی ١٩٢٥ تواناي یاری کردن و هەڵخەڵەتاندنی کوردی لەکەمالیەکان سەندەوە، ئیتر لایەنگرانی هاریکاری کردن لەگەڵ کەمالیەکاندا دژی ئینگلیز لەکوردستانی باشووردا دوا

هەناسەی کێشا)[25] و زوربەی سەردارو سەرەك ئێڵەکانی کورد پەیوەندیان بچڕیو لەهاوکاریو نزیك کەوتنەوە پاشگەز بوونەوەو شێخی بەردەقارەمانو مەحمود خانی دزلیو سمایل خانی سمکۆو زۆری تریش هاتنە ریزی نەیارەکانی تورکو ئەوەتا کەسایەتییەکی گەورەی وەك سمایل خانی سمکۆ (کەلەدەورو بەری سالی ١٩١٤وە بۆتە یەکێك لەناوە زۆر ناسراوەکان لای دەزگاو دبلۆماسێکانی رووسیاو بەریتانیاو ئێرانو تورکیاولەبالیۆزخانەی هەریەك لەو وڵاتانەو هەریەك لە وەزارەتی هەندەرانیان دۆسێیەکی گەورە بۆ سمکۆ خان تەرخان کراوە)[26] و ماوەیەکی زۆر بەگفتی تورکەکان هەڵخەڵەتاو (بەلام شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانو رەفتاری بێئەندازەو دڕندانەی کەمالییەکان لەگەڵ رابەرانی کوردی باکووردا هەموو ئەو کوردانەی بەخەبەرهێنا کەتورك دەستخەرۆی کردبوون. حوزەیرانی سالی ١٩٢٥ بریاری خنکاندنی شیخ سەعیدی پیرانو دکتۆر فوئادو نزیکەی پەنجا نیشتمان پەروەری دلسۆزی تری کوردی باکوور دەرچوو، ئەم هەواڵە بەجاریك ناخی دەروونی هەموو کوردیکی دلسۆزی هەژاند، کوردی بەغداد رۆژی ٢٦ی حوزەیران سالی ١٩٢٥ کۆبوونەوەیەکی گەورەیان لەپارکی مۆد ساز کردو بروسکەی نارەزایی خۆیان دابەکۆمەلەی نەتەوەکانو گشت دەوڵەتە گەورەکان)[27].

وادیارە (ئەم بەسەرهاتە دڵتەزێنانە سمکۆیان بەجارێك شێتگیر کردووە، پاڵیان پێوە نا بەرانبەری تورك بەهەڵویستی خۆیدا بچێتەوە، سمکۆ زوو دەبزوا، زوو بریاری دەداو دەستو برد ئەوەی دەکرد کەبەراستی دەزانیو پێی دەکرا، لەو کاتەدا لەناو هەمواندا دوربینی بابەکر ئاغای پشدەری دێتەوە یاد، یەکسەر نامەیەکی تایبەتی بۆ ئەوو لەرێگەی ئەوەوە ژمارەیەك نامەی تر بۆ رابەرانی کورد بەرەشید جەودەت دا دەنێرێت)[28] و لە رەفتارەکانی تورك ئاگاداریان دەکاتەوە.

ئەم نامەیەی سمکۆ کەناردویەتی بۆ (بابەکر ئاغای پشدەری)[٢٩] میژووی ٢٦ی حوزەیرانی سالی ١٩٢٥ی بەسەرەوەیە (واتا لەو رۆژانەدا کەلەدیار بەکر بریاری خنکاندنی شیخ سەعیدی پیران و هاوەڵەکانی دەردەچێت، ئینگلیزەکان یەکسەر نامەکەی سمکۆ دەکەنە ئینگلیزی و وینەیەکی لی دەنیرنە لەندەن و بەغدا، دانەیەك لەو نامەیە بەئینگلیزی لەناو فایلی ژ (١١، ١٦، ٦، ٥) لەئارشیفی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی رۆژگاری پاشاییدا لەبەغدا هەڵگیراوەو ئەمەیش دەقی وەرگیڕاوی ئەو نامەیەیە کەلەخۆیدا بەڵگەنامەیەکی میژوویی بایەخداری پر لەدەرس و پەندە).[٣٠]

*سۆمای*

*٢٦ی حوزەیرانی ١٩٢٥*

*بۆ بابکر ئاغا*

*برای بەریزم*

*پتر لەجاریك باسی دروستی و تیگەیشتنی خۆمم کردووە دەربارەی ئەو سیاسەتەی ئیوە چەند ساڵیکە لەپیناوی بەرژەوەندی و بەرەوپیش چوونی نەتەوەکەماندا پەیرەوی دەکەن، رەفتاری دڵرەق و درندەی تورك لەگەڵ گەلەکەماندا تایبەت لەم چەند مانگەی رابردودا، لەوانەی گەیاندین کەباوەرمان پێ یان بوو، لەوە دڵنیام لەمەودوا لەسەر ریبازی خۆت سوورتر دەبیت و کۆششێکی زۆر بۆ رزگار کردنی نەتەوەکەمان دەکەیت، تورکەکان هەمیشە نەیارمان بوون، ئەویش نەك تەنیا لەبەر ئەوەی بریاریان داوە نەتەوەکەمان قر بکەن، بەلکو لەبەر ئەوەیش کەبەتەواوەتی دەستبەرداری ئیسلام بوون و تەخت و تاراجی خەلافەتیان هەڵتەکاندووە، نامەی نەسیحەتم بۆ ژمارەیەك لەهاوریێ هەڵخەلەتاوەکانمان نووسیوە. ئەوانەی باوەریان بە تورکەو تائیستاش هەر خزمەتی دوژمنی باوە کوشتەی ئایین و نەتەوەکەمان دەکەن، رەشید جەودەت ئەفەندی ئەو نامانەتان بۆ دەهێنیت، ئیوەش بۆیانی رەوان بکەن، ئەو*

*نامانە سەرنجیان بۆ ئەو راستییانە رالەکیشن کەبۆمان شی کردوونەتەوە، لەسەر تۆیش پێویستە لەمەودوا خۆتیانی لێوە نزیک بکەیتەوەو وایان لێ بکەیت لەدیوی ناوەوەی ئەو سیاسەتە تیبگەیەنن کەتۆ پەیرەوی دەکەیت، بەو جۆرەش ئێوەو ئەوان دەتوانن بەرەیەکی گەورەی ئەوتۆ پێک بهێنن کەببێتە پاڵپشتمان بۆ سەندنی تۆڵەی شەهیدەکانمان و ئەوانەی خۆبەخت دەکەن. من تەواو لەگەڵ سیاسەتی تۆدام، چونکە ئەو رێگە دروستەی تێدا وەدی دەکەم کەبۆی هەیە بمانگەیەنێتە رزگاری گەلەکەمان، رەشید جەودەت لەفەندی بەدوورو دریژی باسی درندەی تورکەکانت بەرانبەر کورد پێ رادەگەیەنێت، لەگەڵ ریزی زۆرم، هیوای سەرکەوتنت لە قوڵایی دڵمەوە بۆ دەخوازم.*[31]

*ئیمزا*

*سمکۆ*

ئەم باوەر پیکردنەی کورد بەمستەفا کەمال ودروست کردنی پەیوەندی تەنیا کوردەکانی نەگرتبووە، (ئارنست هەمەنگوای)[32] لەوتاریکدا بەناوی- چەند نامەیەك لەئەستەنبوڵ داگیرکراوەوە لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی- بۆ رۆژنامەی The Toronto Daily star رۆژی ١٩٢٢/٢/٢٤ دەنووسێ:

(هەتا پێش چەند مانگێك جیهانی ئیسلام مستەفا کەمال ی بەسەلاحەدینی ئەیوبی دووەم دەبینی، ئاواتیان ئەوەبوو کەبەئیسلام شەر بکا لە دژی مەسیحی‌یەکان و ببێ بەرابەرێك لەبەردەم هەموو دەوڵەتانی شەرقی لەجەنگێکی پیرۆزدا لەدژی مەسیحی‌یەکان، بەلام جیهانی شەرقی ئیستا پەیتا پەیتا باوەری بەمستەفا کەمال نامێنێ و هەندێك موسلمانان کەخۆم قسەم لەگەڵ کردون دەیان ووت: مستەفا کەمال خیانەتی لەگەڵ کردووین ئێستا کەس باسی جیهاد ناکات[33]

## نامەیەکی مێژوویی شێخی نەمر

یەکێك لەسیفەتە درەوشاوەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد بەرابەرایەتی شێخ مەحمودی حەفید زادەی بەرزنجی لەوەدا خۆی دەنوێنێت کەلەسەرەتاوە تا بنەتای رۆژانی شۆرش و بزوتنەوەو هەڵسورانی لەبواری شۆرش و سیاسەت و کوردایەتی دا و بەپێی تواناو دەرفەت و هەل و مەرجی رەخساو ویستویەتی کەپەیوەندییەکانی بەجیهانی دەرەوە پەرە پێ بدات و پاریزگاری نەپچرانی رایەلەکانی بکات و هەوڵەکانی لەچوارچێوەیەکی تەسکی ناوچەییدا نەمێنێتەوەو کۆششەکانی سنوری وڵات بېرن و دەنگی زوڵالی نەتەوەیەکی چەوساوە بگەیەنێتە ئەو دیو سنورو لەم کارەیشدا دەستەیەك لەسەرۆك ئێل و کەسایەتییە ناسراوەکانی کورد لەگەڵیدا هاوکار بوون.

رۆژی ۹/۱۰/۱۳٤۱ی کۆچی کە دەکاتە سالی ۱۹۲٤ شێخی نەمر نامەیەکی چری ناوەرۆك دەوڵەمەندی لە سیانزە خاڵدا بۆ کەمالییەکانی تورکیا ناردووەو زانای مێژوو نووس د.کەمال مەزهەر ئەحمەد بەناونیشانی (نامەیەکی ونی شێخ مەحمود بۆ کەمالییەکان)[٣٤] سەربوردێکی کورتی نامەکەی بلاوکردۆتەوەو دواتریش دەقی تەواوی نامەکەی بۆ خاوەنی ئەم کتێبە ناردووە، ئێمەیش دوای لێدوان و بەسەر کردنەوەی ناوەرۆکەکەی دەقی نامەکە لەبەشی بەڵگەنامەدا بلاو دەکەینەوە.

د. کەمال سەبارەت بەنامەکە دەڵێ (کەس تائیستا بەو نامەیەی نەزانیوە کەدیارە دەبێ شێخ مەحمود بەتورکی نوسیبێتی و دەقی ئیستا لە ئارشیفە تایبەتییەکانی تورکیادا هەڵگیرابێت، ئینگلیزەکان وێنەی ئەو نامەیان دەست کەوتووەو یەکسەر کردویانەتە ئینگلیزی و ناردویانەتە وەزارەتی فرۆکەوانی و مستەعمەرات لەلەندەن)[٣٥]

ئەم نامەیە یەکێکە لەبەڵگەنامە مێژووییە سود بەخشەکانی رۆژگاری شێخی نەمرو بریتییە لەسیانزە خاڵی چرو پری سەرەکی و هەریەکەیان بۆ مەبەست و باسێکی گرنگی روداوەکانی ئەو سەردەمە تەرخان کراوەو گەلێ لایەنی بارو دۆخی سیاسی ئەو رۆژگارە روون دەکاتەوەو تەمو مژی دەرەوێنێتەوەو دەقی ئینگلیزی نامەکەش نزیکەی سێ لاپەرەیە.

(بایەخی ئەو نامەیەی شێخ مەحمود زۆرە، چونکە لەگەرمەی بێنەو بەرەی کێشەی بەناوبانگی موسڵدا نوسراوە٬سەرباری ئەوەی گەلێك زانیاری مێژوویی

بایەخداری تێدایە کەبەشێکیان تیشك دەخەنە سەر لایەنێك لەریبازو خەباتی ئەو رۆژانەی شێخ مەحمود)[٣٦]

لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ ئەو رۆژگارە رابکێشین کەشێخی نەمر بیری لەم پەیوەندی‌یە کردووەتەوەو لەپیناوی بەرژەوەندی سیاسەتی ئەو سەردەمەدا رووی کردە کەمالی‌یەکان تا بتوانێت لەو پەنجەرەیەوە کەلکێ وەربگرێت. بۆ ئەم مەبەستەیش دەتوانین بلێین کە (مێژووی پەیوەندی نێوان شێخ مەحمودو کەمالی‌یەکان لە ئەیلولی سالی ١٩٢٢ بەدولوە دەست پێ دەکات، واتە لەو رۆژگارەی شێخ پێ‌ی نایەوە ناو خاکی کوردستانەوە دوای ئەوەی لەهیندستان ئازاد کرا، ئینگلیزەکان دەیانویست شێخ کوردستانی باشووریان بۆ دابین بکات‌و بەر لەدەست دریژی کەمالی‌یەکان بگرێت، ئەویش بەپێ‌ی لیکدانەوەی خۆی هاتبووە سەر ئەو بروایەی کەبەرژەوەندی کورد لەوەدایە دەست بخاتە ناو دەستی ناحەزانی ئینگلیزەوە، چونکە ئەو مارلنگازی دەستی ئینگلیز بوو بۆیەکا دوای ئەوەی سەرەتا ئەوانی تاقی کردەوە رووی کردە شۆرەوی‌و کەمالی‌یەکان‌و رەزا شا کەبەداخەوە هیچ کامێکیان دادیان بۆی نەدا، ئەو راستیەی لەچەند شوێنێکی ئەم نامەیەشدا رەنگی داوەتەوە.

شێخ مەحمود بەرلەوەی بگاتەوە سلێمانی بەماوەیەك بەنهێنی پەیوەندی بەکەمالی‌یەکانەوە کرد، ئەوساکە هەموو شۆرشگیرانی ناوچەکە پەنایان دەبردە بەرئەوان چونکە ناحەزی ئینگلیز بوون، لەولنە رابەرانی شۆرشی بیست، کەواتە ئەو کارەی شیخ مەحمود لەگەل رەوتی مێژوودا دەگونجا، ئەم نامەیەش دەچێتە هەمان خانەوە، بەلام بەداخەوە کەمالی‌یەکان دەستی شێخیان بری‌و هیچیان بۆی نەکرد، ئەوان دەیانویست بەچەند نیشان‌و (میدالیك)و ژمارەیەك گفتی درۆ کورد بکەنە داردەستی خۆیان بۆ زەوت کردنی کوردستانی باشور)[٣٧]

لایەنیکی گرنگی ئەم نامەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەئاستی پەیوەندی نێوان کوردو عەجەم ئاشکرا دەکات و لەو تەنگژەو قۆرتانە دەدویت کەهینراوەتە ریی شۆرشی کوردەوەو (کەئەوانیش بەئاشکرا شێخیان دەستخەرۆ کردووەو پەلپیان پێگرتووەو کۆسپیان خستۆتە رێی، شێخ نامەکەی بەم باسە دەست پیکردوەو لەخالی یەکەمیدا نوسیویەتی و دەڵێ:

هەرچەندە لەو نامەیەتاندا کە ژمارەکەی (٢٢٤٨)ه رۆژی ١ی تشرینی یەکەمی سالی ١٣٤٢ك (١٩٢٤ن) نوسیوتانەو لەریگەی فەتاح بەگ[٣٨] نوینەری موسلەوە پێمان گەیشت باسی ئەو کۆششەتان کردووە کە داوتانە بۆ دابین کردنی یاریدەی عەجەمەکان، بەلام لەو رۆژەوەی لە خورمال لەگەل نوێنەری بەریتانیاندا کۆبوونەوە کاربەدەستانی سەرسنووری ئەوان ئاشکرا کەوتوونەتە دوژمنایەتیمان و هەمەجۆر کۆسپ و تەگەرە دەخەنە رێگەمان، باشتریش وایە ئەوان بێ پێچ و پەنا هەستی ناحەزانەی خۆیان بەرانبەرمان دەربڕن، هەرچەندە ئەو هەولانەی دەیدەن بۆ قەدەغەکردنی هاتووچۆو پەیوەندی‌یەکانمان هیچیان بۆ ئەوە نەهیشتووەتەوە کە بە روونی هەست بە هەلویستی دوژمنانەی راستەقینەیان نەکرێ، ئەم باسە بە وردی خرایە بەردەم وەزیری جەنگ عەبدوللا خانی تەهماسی لەکاتی ئەو سەردانەیدا کە لەم چەندانەی دوایی‌یەدا بۆ ناوچەکە کردی‌و داوای لی کرا چارەسەری ئەو کێشەیە بکات، کەچی لەگەل ئەوەیشدا کاربەدەستە نەخوێندەوارەکانی سەرسنوور شتێکیان نەکرد بۆ ئەوەی هیچ جۆرە ئامادەیی‌یەك نیشان بدەن کە نیازیانە دەست لە بەدفەری خۆیان هەلبگرن و رەفتاریان لەگەلمان دا بگۆرن."[٣٩].

سەرەبارەت بە رەوشتی ئینگلیزەکان و بیروڕای شێخی نەمر بەرانبەریان لە هەمان خالی یەکەمی نامەکەدا رقی ئەستووری خۆی نیشان دەدات و دەڵێ: (لە

رابوردودا بەدرێژی باسی هەموو تەماعە نارەواو ساختەکانی حوکمەتی بەریتانی و بیروڕا ژەهراوییەکانم کردووە، من ئەوی هەمەو نیمە.. بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە تەرخانم کردووە بۆ خزمەتی جیهانی موسوڵمانان و هەرگیز ڕێگە بەخۆم نادەم ببمە داردەستی ئەو بیروڕا هەڵخەڵەتێنەرانەی حوکمەتی بەریتانی بڵاویان دەکاتەوە)[٤٠]. و دیسان لە خاڵی شەشەمی نامەکەیدا دووپاتی دەکاتەوە (کە ئەو لەوکەسانە نیە کە بە فرت و فێڵی ئینگلیز هەڵبخەڵەتێ)[٤١].

سەبارەت بە بیروباوەڕیشی بەرانبەر بە هەندێ کەسایەتی ناسراوی ئەو ڕۆژگارە لە خاڵی دەیەمی نامەکەدا شێخی نەمر (هێرشێکی توندو تیژ دەکاتە سەر -بابەکر ئاغای پشدەری- و -مستەفا پاشای یامولکی- و هەردووکیان وەك نۆکەری ئینگلیز باس دەکات)[٤٢].

لە خاڵی دوازدەمینی نامەکەیدا دیسان شێخ دێتەوە سەر باسی ئینگلیزو دەڵێ (دڵنیاتان دەکەم ئێستە لە هەرکات زۆرتر بە پەرۆشم بۆ گرتن و دیل کردنی ئینگلیزەکان، دەمەوێ ئەوەیان پێ بکەم کە لە دەربەند پێم کردن)[٤٣] کە لێرەدا وەك دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت (دیارە مەبەستی گرتنی ئینگلیزەکانە لە سلێمانی لە مانگی مایسی ساڵی ١٩١٩دا، چونکە لە دەربەند شێخ خراپ شکاو بە برینداریو یەخسیری کەوتە دەست ئینگلیزەکان)[٤٤].

### مەحمود خانی دزلی و ناوەڕۆکی نامەکە:

خالی نۆیەمی نامەکەی شیخی ئەمر تەرخان کراوە بۆ سەرداری ناوچەی دزلی و هەورامان (مەحمود خانی دزلی)و تییدا لەوە دەدوێ کە خانی دزلی دیاری و میدالی کەمالیەکانی رەت کردووەتەوەو وەری نەگرتووەو ئەوەتا دەڵێ: (زەخیرەم داوەتە هاوڕێی دڵسۆزو بەئەمەکمان خانی دزلی کە پیاویکی بەهادارە، هەرچەندە چەند جارێك میدالەکەی رەتکردەوە، بەلام من دوای گەرانەوەی ئۆزخان بەگ زۆرم لێی کرد کە قەبولی بکات، بە راستی مەحموود خان دۆستەو شایانی هەموو جۆرە بایەخ پێدان و چاودێرییەکە)[45].

ئەوەی پیویستە بوترێ کە (مەحموود خانی دزلیش سەرەتا بڕوای زۆری بە کەمالیەکان بوو، ئەویش پێی وابوو بە یاریدەی ئەوان دەتوانێ درێژە بە خەباتی خۆی بداتو لەو راپۆرتەیان دا کە ئینگلیزەکان دەربارەی رەوتی کاروباری کارگێڕی عیراق لە سالانی ١٩٢٠-١٩٢٢ دا داویانەتە -کۆمەلەی نەتەوەکان- عصبة الامم- بەتایبەتی باسی نامەیەکی مەحموود خانی دزلیان کردووە کە ناردویە بۆ مستەفا کەمال و داوای چەکی لێ کردووە تا بتوانێ ئینگلیز لە سلیمانی وەدەرنێ، کەمالیەکان هیچیان بۆ ئەویش نەکرد بۆیەکا دڵی لێیان رەنجابوو، باوەری پێیان نەمابوو)[46].

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی دەوتەم:

(١)لە هاوینی سالی ١٩١٤دا جەنگی یەکەمی جیهانی لە نیوان دەولەتانی میحوەرو هاوپەیمانان دا هەلگیرسا، لە رۆژی (٢)ی تشرینی هەمان سال دا دەولەتی عوسمانی چووە جەنگەوەو دایە پال دەولەتانی میحوەر. (دەولەتانی ناوەند پێکهاتبوون لە ئەلمانیاو نەمساو ئەوانەی دواتر هاتنە پالیان، بەلام دەولەتانی هاوپەیمان بریتی بوون لە بەریتانیاو فەرەنساو ئەو دەولەتانەی هاتنە ریزیان).

(٢)ئەو جوولانەوە گەورەیەی میللەتی تورك دوای شەری یەکەم بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال بۆ رزگارکردنی ولاتەکەی بەرپای کرد لە رابەری سیاسی‌دا بە جوولانەوەی کەمالی‌و بەشدارەکانی بە کەمالی‌یەکان ناوبرین. (د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆژی کوردستان، ژ٢ تەمموزی ١٩٧١)

(٣)دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆژی کوردستان (گۆڤار)، ژ٢، تەمموزی ١٩٧١، هەروەها (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی کورد، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل٧١.

(٤)هەمان سەرچاوە.

(٥)دکتۆر جەبار قادر، رابوون (گۆڤار، ژ ١٧، ١٨، سوید، ١٩٩٦.

(٦)دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆژی کوردستان (گۆڤار)، ژ٢، تەمموزی ١٩٧١، هەروەها (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی کورد، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل٧٢ هەروەها

A, M. Hamilton. Road through Kurdistan, Landon. 1937, p.p. 295, 296.

(٧)دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆژی کوردستان (گۆڤار)، ژ٢، تەمموزی ١٩٧١ هەروەها (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی کورد، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥، ل٧٢، ٧٣.

(٨)هەمان سەرچاوە.

(٩)هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

(١٠)هەمان سەرچاوە.

(١١)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ )گۆڤار(، ژ١٢٥ ئازاری ١٩٩٥.

(١٢)سەرچاوەی پێشوو، هەروەها بڕوانە:

A. Toynbea, Angora and the British Empire in the East, (The Contemporary Review)> London, June, 1923, p.p. 336-337.

(١٣)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو،

هەروەها بڕوانە:

الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية - العراقية -الانكليزية- التركية و في الراي العام، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٥٧، ص ٢٧٢، ٣٠١، ٣١١.

(١٤)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو،

(١٥)ئۆزدەمیر ناوی عەلی شەفیقەو بە رەگەز میسری بووەو یەكێك بوو لەو ئەفسەرە دڵسۆزانەی كە لایەنگری مستەفا كەمال بوو، ساڵی ١٩٢٢ بەهێزێكی سەربازییەوە گەیشتە ڕەواندوز.

(١٦)رەفیق حیلمی (١٨٩٨-١٩٦٠/٨/٤) نووسەرو خەباتكاری بەناوبانگی كورد. لە یادداشتەكانیدا كە لە سەردەمی خۆیدا شەش بەرگی لێ بڵاوكردووەتەوە زۆر لایەنی ئەم پەیوەندییەی ئاشكرا كردووە.

(١٧)ئەحمەد تەقی (١٣١٠ك-١٣/١٩٦٠/١١ز) خەباتكاری دلسۆزو خەمخۆری كوردو لەم بوارەدا دەوری باڵای بینیوەو بۆ ئەم مەبەستەیش بڕوانە: خەباتی كورد لەیادداشتەكانی ئەحمە تەقیدا، ڕێكخستن و ئامادەكردنی جەلال تەقی، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بغداد ١٩٧٠

(١٨)غەفور خانی ناو دەشت لە بنەماڵەیەكی ناسراوی ناوچەی رانییەیەو (یەندزە)ی بناری قەندیل گوندی سەرەكییانەو توركی زانیكی چاك بووە.

(١٩)دكتۆر كەمال مەزهەر دەڵێ لە بەڵگەنامەكەدا بەو جۆرە ناوی هاتووەو مەبەست عەبدوڵلا ئاغای كوری حاجی تایەر ئاغای كوری حاجی بەكر ئاغای گەورەی سەردار حەریزیانی ناوچەی كۆیەیە.

(٢٠)هیچ زانیارییەكمان سەبارەت بەو سیتۆ ناوە لەبەردەستدا نییە.

(٢١)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار) ژ ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥.

(٢٢)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، رۆژی كوردستان، ژ٢، تەمموزی ١٩٧١، هەروەها: چەند لاپەرەیەك لە مێژووی كورد، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٧، ل٧٦، ٧٧.

(٢٣)هەمان سەرچاوە.

(٢٤)شێخ سەعید كوری شێخ مەحموودەو سالی ١٢٨٥ی كۆچی لە دایك بووە، دانیشتووی ئاوایی (كلدان) بووەو دواتر چووەتە (پالۆ) كە یەكێكە لە ئاواییەكانی سەر بە ناحیەی (منشی كورد) لە توركیا كە ئەم ناحیەیە سەر بە ولایەتی (گەنج)ە.

باپیری شێخ سەعید كە (شێخ عەلی) بووە تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە، لە شەرع و ئاین دا زانایەكی بالادەست بووە، هەر لە سەردەمی باوكیدا دەستی بەبلاوكردنەوەی ئاین كردووە. دەستیشی لە شیعردا هەبووەو بە كوردیو فارسی و عەرەبیو توركی شیعری وتوە، دوای كۆچی دوایی باوكی لە سالی ١٣٠٦ی كۆچیدا شێخ سەعید بووە بە جێ نشینی، ئەم سەردارە لە سالی ١٩٢٥دا لەلایەن توركەكانەوە كرا بە دارا.

(٢٥)دكتۆر جەبار قادر، رابوون (گۆڤار) ژ ١٧،١٨، سالی ١٩٩٦، سوید.

(٢٦)دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، رەنگین (گۆڤار) ژ١١٨، ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨.

(٢٧)هەمان سەرچاوە.

(٢٩)بابەكر ئاغای كوری سەلیم ئاغای كوری بابەكر ئاغای كوری حەمەد ئاغایەو سالی ١٨٧٠ی زایینی لەدایك بووە. لە رۆژی ١٩٥٨/١/٣ لە ئاوایی گردەسپیان ی سەر بە قەزای پشدەر، كۆچی دوایی كردووەو هەرلەوێ نێژراوە.

بابەكر ئاغاو هەباسی مەحموود ئاغا هەردووكیان سەرۆكی عەشیرەتی میراودەلی بوون و تا كۆچیان كردووە هەر سەرۆك بوون، زۆربەی زۆری ئەم عەشیرەتە لە باشووری كوردستاندایەو كەمێكیشی لە رۆژهەلاتی كوردستاندا نیشتەجێن (بۆ ئەم زانیاریانە بروانە: محمود ابراهیم پیمالكی، مجله گولان العربی، العدد ٤٠، ٢٥ ایلول ١٩٩٥)

(٣٠) دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، رەنگین (گۆڤار، ژ١١٨، ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨.

(٣١)هەمان سەرچاوە.

(٣٢)ئەرنست هەمەنگوای لەسالی ١٨٩٩ لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدایك بووەو یەکێکە لەرۆمان نووسە گەورەکانی جیهان، خاوەنی رۆمانی (الشیخ والبحر) و (الفردوس المفقود)و (البحر والقدر)و (لمن تقرع الاجراس)و زۆری تره، ساڵی ١٩٦١ کۆچی دوایی کردووەو ساڵی ١٩٥٤ پاداشتی -نۆبل-ی وەرگرتووە.

(٣٣)سەلام ناوخۆش، قەژین (گۆڤار)، ژ١٠، زستانی ١٩٩٨، دهۆك.

(٣٤)دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، رەنگین (گۆڤار)، ژ١٠٧ن ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٧، بەغداد.

(٣٥)هەمان سەرچاوە.

(٣٦)هەمان سەرچاوە.

(٣٧)هەمان سەرچاوە / لەلایەکی ترەوە پێویستە ئەوە بزانین کەشێخ مەحمود رۆژی ٣٠/ئەیلولی ١٩٢٢ گەیشتەوە سلێمانی.

(٣٨)فەتاح بەگ ژن برای شیخ مەحموودە، یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەو وەفدەی تورکیا کە لەتەك وەفدی کۆمەڵەی نەتەوەکان دا هاتە عیراق بۆ توێژینەوەی کێشەی موسل.

(٣٩)رەنگین، ژ ١٠٧، ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٩٥ هەروەها دەقی بەڵگەنامەکە بەزمانی ئینگلیزی.

(٤٠)هەمان سەرچاوەو بەڵگەنامە.

(٤١)هەمان سەرچاوەو بەڵگەنامە.

(٤٢) هەمان سەرچاوەو بەڵگەنامە.

(٤٣) هەمان سەرچاوە .

(٤٤)هەمان سەرچاوە.

(٤٥)هەمان سەرچاوە.

(٤٦)هەمان سەرچاوە / دکتۆریش زانیاری سەبارەت بەپەیوەندیو ناردنی نامە لەلایەن مەحمود خانی دزڵی‌یەوە بۆ مستەفا کەمال لەم سەرچاوەیەوە وەرگرتووە:

((Iraq. Report on Iraq administration October 1920-March 1922)) London,1923. P116

## بەشی هەشتەم

# خانی دزلّی و سەردار رەشیدی ئەردەلاّن

# و

# لاپەڕەیەکی مەرگەساتی مێژوویی

بەکۆتایی و نەمانی چەرەدوورکەلّی جەنگی یەکەمی جیهانی و نوشوستی و خۆبەدەستەوەدانی عوسمانی یەکان و ئیمزا کردنی ئاگر بەستی -مۆدروس- لەتشرینی دووەمی ١٩١٨دا خەباتی رزگاریخوازی ناوچەکە بەگشتی و نەتەوەی کورد بەتایبەتی رووی لەقۆناغێکی نوێ کرد، بارودۆخی کورد وەك مەسەلەیەکی سیاسی خۆی نواندو بیرو باوەری زیندووی نەتەوایەتی کەوتە گەشە کردن و بەخۆداهاتن.

بزوتنەوەو راپەڕین و بانگەوازی رزگاری رووبەری کوردستانی تەنی یەوە، دیارە رۆژهەلاّتی کوردستان-یش لەم جموجوڵە تەریك نەبوو، چونکە نەتەوەی کورد لەم بەشە زەوت کراوەیدا لەسەردەمی پێش (قاجاری)[1] یەکانەوە تا رۆژگاری (رەزاشای پەهلەوی) و دواتریش لەگەلّ کاروانی خەبات و ژیاندا

بەرێگاوە بووە. یەکێك لەو ڕۆڵە بەجەرگانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کەتائێستا (لێکۆڵینەوەی مێژوویی تێروتەسەلی لەبارەوە نەنووسراوە عەباسخانی سەردار ڕەشیدە کەلە نەوەی-ئامانەللاخان-ی دوا والی ئەمارەتی ئەردەڵانە)[2].

(سەردارڕەشید)[3] شۆڕشگێڕێکی نەبەردو دڵسۆزو لەنەوەی ئەردەڵانی‌یەکان بوو، تەنانەت خۆی بەسەروەسێت و میراتگری ئەوان دەزانی و بەگیان و دڵ بیری لەمێژووی پر لەکارەساتی ئەو ئەمارەتە تێکچووە دەکردەوەو پلان و نەخشەی بۆ زیندوکردنەوەو بنیات نانەوەی دادەناو بەئەلهاوە دەیویست سەرلەنوێ پشکۆی ئاگردانی ئەو ئەمارەتە بگەشێنێتەوەو ناوچەکانی سنەو حەسەناواو ڕەوانسەرو دەوروبەری لەژێر زەبروزەنگی ستەمکاران دەربهێنێ و بانگی سەربەخۆیی و ئازادی بۆ جارێکی تر بەگوێی جەماوەری کورددا بچرینێ.

دیارە سەردار ڕەشید وەك کەسێکی قالبووی خەبات و تێکۆشان لەو باوەڕەدابووە کە بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەو خۆسازکردن بۆ بەرەنگار بوونەوەی ستەمکاران پێویستی‌یەکی ئیجگار زۆری بەهاوکاری و دەستگیرۆیی عەشیرەت و شەخسی‌یەتە ناودارەکانی دەوروبەر هەیە.

لەسەرەتاوە بەنهێنی و دواتریش بەئاشکرا بەرنامەی کاری بۆ سەرۆك عەشیرەتەکانی دەوروپشتی دیاری کردووەو بەزوویی (ژمارەیەکی زۆری لەسەرۆك عەشیرەتەکانی موکریان و هەورامان و ناوچە کوردی‌یەکانی تری لەدەوری کۆبووەوە، جگە لەمانەیش پەیوەندی لەگەڵ ڕوسەکان و-سالار الدولە-دا بەتین کرد، زۆری نەخایاند دەسەڵاتی گەیشتە کرماشان و سنەو شوێنەکانی تر)[4]

یەکێك لەو سەرۆك و عەشیرەت و بەدەسەڵاتانەی کەلەپێشەوەی ئەو کەسانەدا بووە بەدەنگ ویست و خواستی سەردار ڕەشیدەوە چووەو بەڵێنی هاوکاری پێداوە سەرداری هەورامان مەحمود خانی دزڵی بووە. خانی دزڵی لەمەسەلەکانی خەبات و ژیان و کاروباری نەتەوەیی و ڕێبازی ڕزگاریخوازی‌دا

لێکدانەوەی تایبەتی و ڕەنگانەی خۆی بووەو بەپێی دەرفەت و ڕەخساندنی باروذۆخی گونجاوو بەدرێژایی مێژووی هەڵسوڕانی لەم بوارەدا دەوری کارای دیوەو بەوچاوەوە ڕووداوەکەی هەڵسەنگاندووە کەبۆ خزمەتی کوردو ڕزگارکردنی خاکە زەوت کراوەکەیەتی، ئەم یاریدەو پشتگیرییەی خانی دزڵی چەندین جارو بەشێوەو ڕێچکەی جیاواز ئەنجامی داوەو نموونەی بەرچاو روونیش شۆڕشەکانی شێخی نەمرە لەباشووری کوردستان و سەردار ڕەشیدی ئەردەڵانە لەسنەو حەسەناواو ڕەوانسەری رۆژهەڵاتی کوردستان. (عەباسخانی سەردار ڕەشید لە١٣٣٦ی کۆچی-١٩١٧ی ز، دیارە بەگەڵ پێش ئەم مێژووەش هەرخەریك بووە، بەنیازی ئەوەی لەنەوەی ئەردەڵانەکانەو هەقی میراتگری هەیە، لەرەوانسەرەوە دەستی کرد بەبزوتنەوەو شۆڕش نانەوە بۆ سەندنەوەی حکومەتی زەوت کراوی ئەردەڵان، لەژێرەوەو بەئاشکرا لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو وڵاتەدا قسەیان کرد بەیەك، ئەوانیش لەبەر ئەوەی کەسەردار ڕەشید لەبنەماڵەیەکی ئەمارەتی کوردی‌یەو خۆیشی پیاوێکی لێهاتووی بەدەسەڵاتە، هەموو قسەیان دایە، بەرە بەرە لەوەکیلی جوانرۆوە، لەحسێنخانی رەزاوو جافەرسانی لهۆن و مەحموودخانی کانی‌سانان و مەحموود خانی دزڵی و حەمەخانی بانەوە، لەولایشەوە سنجەر خانی میاوەران و حسێن قولیخانی کولیایی، ئەمانە هەموو لەسەر قسەی سەردار ڕەشیدو بۆ یاریدەدانی بەری کەوتن بۆ وڵاتی-سنەو حەسەناوا-کەشوێن ئاگردانی‌ئەمارەتی باو باپیری سەردار ڕەشید بوون. لەو مێژووەدا چووە سنەو بەوناوەی کە حکومەتێکی کوردی سەرلەنوێ دروست بکاتەوەو ماوەیەکی باش دەوری گێڕا، رووسەکانیش لەژێرەوە قسەیان دایە، بەتایبەتی-ژەنەراڵ فسینکۆو ژەنەراڵ باراتۆف) کە ئەفسەرانی رووس بوون و ئەو وڵاتەیان لەو دەوری هەرچی و پەرچی‌یەدا داگیرکردبوو، پەیمانیان دایە کەبەهەموو جۆر بۆ دامەزراندنی ئەم حکومەتە درێغی ناکەن، ئەو لەوێوە لەدروست کردنی ئەم کارو فرمانەدابوو،

لەم لایشەوە لەولاتی سلیمانی و شوێن هەواری بابانەکان (شێخ مەحمودی شیخ سەعید)یش خەریکی گێرانی دەوری کوردایەتی بوو.

عەباسخان لەو سەردەمانەدا کەهێشتا بەناوی حوکمداری‌یەوە نەهاتبووە سنە هەرجارە لەرەوانسەرەوە دەستدرێژی بۆ کرماشان و دەورو بەری دەکرد. دەنگ و ئاوازی-سالارالدولە-یش لەوکاتانەدا باوێکی باشی هەبوو، ئەویش بۆ سەندنەوەی تەختی ئێران کەگوایە لێی زەوت کرابوو، لەبەرئەوە هەردوکیان شەریکی یەك دەردبوون، سەردار رەشید لەگەڵ ئەویشدا قسەی کردبوو، جالەو دەورانەدا پەلامارێکی مەردانەی کرماشانی‌داو-محەمەد خانی کرماشانی-کەئەویش کرماشانی داگیرکردبوو گرتی و کوشتی و وڵاتی کرماشانی بەتەواوی داگیرکرد.

دیارە لەو سەردەمەدا کە حوکمرانی وڵاتی سنەو ئەردەڵان بوو، حوکمداری کرماشانیشی هەر دەنگی ئەدایەوە، لەم ماوەیەدا کەلەسنەبوو-عەلی ئەکبەرخانی سنجاوی-کەئەویش پیاوێکی ناودارو بەدەسەڵاتی عەشایەری بوو هاتە سنەو فەرمانداری سەردار رەشیدی گرتە دڵ.

سەردار رەشید ماوەیەك بەم جۆرە بەناوی حوکمداری‌یەوە لەسنەرای بواردوو حوکمی لەو ناوەدا رەوابوو، پاشان وردە وردە شەری ١٩١٤-١٩١٨بەسەرچوو، حکومەتی ئێران تۆزێك بووژایەوە، سەردار رەشید سەیری کرد مانەوەی لەسنەدا وەنەبێ قازانجێکی تیابێ و وای بەباش زانی ئەو شوێنی حوکمرانی‌یەی لەسنەوە بگوێزێتەوە بۆ رەوانسەر(*)

حکومەتی ئێران لەو سەردەمەدا بەدوو چاوی تیژی سەرنج چاودێری بزوتنەوەو هەڵس و کەوتی سەردار رەشیدی دەکردو دەیویست بەهۆی چنینی پلانێکی سەرکەوتووەوە دەست بەسەر ئەم شۆرشگێرەدا بگرێ و ئاگری جووڵانەوەکەی دابمرکێنێتەوە، بۆیە دەست و برد کەسەردار رەشید سنەی بەجێ هیشت (حکومەتی تاران بەناوی حوکمداری‌یەوە-عەلی محەمەد خانی

شەریف الدولە-ی ناردە سنە، ئەویش لە ١٣٢٧ی کۆچی داچووە سنەو دەستی بەتوندو تیژی کردو سیاسەتی بەکارهێنا، سەردار رەشیدیش هەرداوای سنەو ولاتی ئەردەلان دەکاتو هەر جارە دەیەوێ هێرش بکا بۆ دەرپەراندنی شەریف الدولە لەناو شاردا)[6].

شەریف الدولە کەسێکی زۆرزانو پیلانگێربوو، دەی زانی بەشەڕو شۆڕ سەردار رەشیدی بۆ لەناو نابرێ، نامەیەکی دۆستانەی بۆ ناردو بانگهێشتی کرد بۆ ولاتی سنەو گوایا ئەو ولاتەی دەخاتە بەردەستو سەردار رەشیدیش بەدەم داواکەیەوە چوو بەلام ئەنجامی چوونەکەی بەوە شکایەوە کەگیراو رەوانەی زیندانی تاران کراو دەست بەجێ شەریف الدولە (دەستی کرد بەرووخاندنی کۆشکی مێژوویی ئامانەللاخانو بەو مەبەستەی کەهیچ شوینەوارێکی ئەم خێزانە کوردی‌یە لەهەرێمی ئەردەلاندا نەمێنێتەوە)[7].

لەئەنجامی ئەم پیلانەدا سەردار رەشید ماوەیەك لەزیندانی تاران دەمێنێتەوەو لەکۆتایی سالی ١٣٣٩دا (سەید زیائەدینی تەباتەبایی وەزارەتی ئێرانی گرتە دەستو لەدەوری ئەودا سەردار رەشید بەرەڵلا بوو، گەرایەوە بۆ ولاتی رەوانسەر)و زۆری نەخایاند سەرلەنوێ لەسالی (١٣٤٠دا کەوتەوەقسە کردن لەگەڵ عەشایەرەکان بۆ سەندنەوەی ئەمارەتی ئەردەلانو دەستەیەکی باش لەرەوانسەرو جوانرۆیی‌و سنجاوی پێکەوەناو دیسان ناوو دەنگی بلاوبووەوە)[8].

لەم کاتەدا (رەزا خانی پەهلەوی) وەزیری جەنگ بوو، سوپایەکی باشی ئامادەکردوو بەفەرماندەیی (ئەمیر ئەحمەدی) پەلاماری جەنگاوەرەکانی سەردار رەشیدی داو لەم شەڕەیشدا زۆربەی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی کەلەپێشدا هاوکاریان لەگەڵ سەردار رەشیددا دەکرد بوونە دوژمنی‌و بەهەموویان شکستی یان بەجولانەوە کەهێناو بەم جۆرە دوای چەند بزوتنەوەیەکی تر سەردار رەشید بۆ دواجار وازی هێناو لەتاران دانیشتو بەشێوەیەکی مەرگەسات

کۆچی دوایی کرد.[٩] ئێمە لەم باسەدا نەمان ویستووە کە سەربوردێکی بەربلاوو سەرتاپاگێڕی شۆڕشەکانی سەردار ڕەشید باس بکەین و نووکی قەڵەم بخەینە سەر هەموو لایەنەکانی، تەنیا ئەو ڕاستی یە ئەدرکێنین کەئەم زنجیرە شۆڕشە وەك هەموو بزوتنەوەو هەوڵ و تەقەللایەکی تر بەهۆی دڵپاکی سەرکردەکان و فروفێڵی دوژمنان و گزی کردنی دۆستەکانی سەری نەگرت و بڵاوەی پی کراو مەبەستی سەرەکیشمان لەم سەرەتاو پێشچاوخستنە دەرخستنی دەوری مەحمود خانی دزڵی بوو لەو بزووتنەوەیەدا، بەڵام لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستی یەش نەشارڕێتەوە کەلەکاتێکدا سەردار ڕەشید بەفرو فێڵی (عەلی محەمەدخانی شەریف الدولە) لە ١٣٣٧ی کۆچی دا دەگیرێ و ڕەوانەی تاران دەکرێ و پاش ماوەیەك دەتوانێ بگاتەوە ناوچەکەی خۆی لەم کاتانەدا بەفروفێڵی (ئەمیر ئەحمەدی) کەفەرماندەی سەربازی ڕەزا خانی پەهلەوی بوو، زوربەی سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان پشتیان لە سەردار ڕەشید کردو پەلاماریان داو نەیان ویست جارێکی تر هاوکاری لەگەڵ بکەن، تەنانەت کە (سەردار ڕەشید ئەم هەواڵەی وەرگرت بە ٥٠٠ ٤سوارێکەوە پەلاماری هێزی عەشایەرو جافەرسانی داو لەکیوەکانی -شمشێرە-شەر هەڵگیرسا، هێزی جافەرسانیش زیاتر لە ٤ هەزارێك دەبوو، لەبەر سەختی شوێنەکەو بەفرو سەرما سەردار ڕەشید هیچی پێنەکراوگەڕایەوە بۆ وڵاتی ڕەوانسەر) (١٠)و دوای چەند شەرو شۆڕێك تەسلیم بەحکومەتی ئیران دەبێ و بەیەکجاری لەئێران دادەنیشێ و یەکێك لەهۆ گرنگەکانی سەرنەکەوتنی دەگەڕێتەوەبۆ گزی کردنی عەشیرەتەکانی دەوروبەری کەبەدرێژایی مێژوو ئەم گزی کردنە لەبیرو باوەری نەتەوەیی و جوڵانەوەی نیشتمانی دا هەربووەو تائێستاش بەردەوامە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم:

(١) بنەماڵەی (قاجاری)یەکان ماوەی ١٣٤ساڵ و ٤مانگو چەند رۆژێك حوکمی ئێرانیان کرد. بۆ ئەمەیش بروانە:

الدکتور کمال مظهر احمد، دراسات تأریخ ایران الحدیث والمعاصر، مطبعة ارکان،بغداد، ١٩٨٥، ص ١٠٣

(٢) یاسین خالد سردشتی، مجلة (مەتین) عدد ٨١، تشرین الاول ١٩٩٨، ص ١٠٨.

(٣) عەباسخانی سەردار رەشید کوڕی عەلی خانی کوڕی محەمەد سادق خانی کوڕی ئامەنەڵلاخانی والی ئەردەڵانە، لە ١٨٦٦کە غولام شاخانی والی مردو ئەمارەتی ئەردەڵان دوایی هات، (ناسرەدین شا)ی شای ئێران مەیدانی بەچۆڵ زانی (فەرامەزای معتمد الدولە)ی بەناوی حکومەتی‌یەوە لە (زیلقەعدەی ١٢٨٤)ی کۆچی دانارە سنەو دەوری ئەمارەتی ئەردەڵان بەتەواوی پێچرایەوە، حکومەتەکانی تاران لەشوێن ئاگردانی بنەماڵەی ئەردەڵان دەستیان کرد بە حوکمداری لە وڵاتی سنەو حەسەناوادا. بۆ ئەم کورتە مێژووە بروانە : عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عیراق، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٩، ل٧١

(٤) الدکتور کمال مظهراحمد، دراسات في تأریخ ایران الحدیث والمعاصر، مطبعة ارکان، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٤٩

(٥) عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عیراق، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٩، ل٧٢

(٦) سەجادی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٧) محمد رؤوف توکلی، جغرافیا وتاریخ بانە، چاپ دوم، ١٣٦٣ش، ل١٩٢.

(٨) سەجادی، هەمان سەرچاوە.

(٩) سەبارەت بەدواڵاپەڕەکانی ژیانی سەردار رەشید باشترین سەرچاوە کەباسی کردبێ نووسەری ئێرانی (عیسی پژمان)ە کەئەفسەرێکی سوپای ئێرانی بووە بەپلەی (عەقید)و پەیوەندیشی لەگەڵ سەردار رەشیددابەیداکردووەو نووسیویەتی (دوای ئەوەی کە سەردار

رەشید چەند ساڵێك لەئاوارەیی و بێ كەسیدا مایەوە، ساڵی ١٣١٣ی هەتاوی كەدەكاتە ١٩٣٤ی زاینی گەڕایەوە مەڵبەندی خۆی پاش لێبوردنی لەلایەن ڕژێمی ئێرانی‌یەوە، بەڵام حكومەتی ئێران زۆری نەخایاند لەبەڵێنی خۆی پەشێمان بوومەوەو سەرلەنوێ گیرایەوەو ماوەی حەوت ساڵی تر لەزیندانی (قەسری قەجەر)دا مایەوە. لەرۆژی ٢٦ی ئەیلولی ١٩٤١داو لەكاتێكدا كە زیندانی ناوبراو شكێنرا سەردار رەشید لەگەڵ هەموو زیندانی و سەرۆك عەشیرەتەكانی تردا كەبەند كرابوون گەڕایەوە شوێن هەواری خۆی، بەڵام جارێكی تر حكومەتی تاران وازی لێ نەهێناو بانگی كردەوە بۆ تاران بەبێ ئەوەی هیچ شتێكی كردبێ و ئەمجارەیان بەدەست بەسەری و لەژێر چاودێری‌دا مایەوە، سەردار رەشید لەم كاتەدا ژیانێكی ناهەمواری بەسەر دەبرد، من بەپێی كارو پیشەكەم زوو زوو ئەمبینی و سەرم لێ ئەداو ئەم حالەتە ناخۆشەی كاری تێ كردمو داوام لەلایەنە لێپرسراوەكان كرد كە سەردار رەشید توانای هیچی نەماوەو لەو ژوورەیدا كە لەئوتێلێكی كۆن دایەو دەكەوێتە پشت بەڕێوەبەریتی شارەوانی تاران حاڵەتی پەرێشانەو بابگەڕێتەوە ناوچەكەی خۆی و ئەو چەند ساڵە كەمەی ژیانی لەوێ بەسەربەرێ، یان بەلایەنی كەمەوە شوێنێكی باشتری بدەنێ، هەرچەندە لێپرسراوانی ئێران پێشنیارەكەمیان پەسەند كرد بەڵام سەردار رەشید رازی نەبوو كەبگەڕێتەوەو وتی (تازەبۆ كوێ برۆمەوە كە هەموو شتێكم لەدەستداو خێزانەكەم نەماو سەرو سامانم بەتاڵان رۆی، بەندیم لەتاراندا زۆر لاخۆشترە كەبەم شێوەیە بگەڕێمەوەو ببمەمایەی گاڵتەجاری لەلایەن دوژمنەكانمەوە)..

بەم جۆرە لەژوورەكەیدا ماوەی (٥) ساڵی ترمایەوەو دواتر كۆچی دوایی كردو تاماوەیەك كەس بەمردنەكەی نەزانیبو، جەستەی تێك چووبوو بەشێوەیەك كە هیچ كام لەكرێكارانی ئوتێلەكە زاتی ئەوەیان نەبوو كە بیهێننە دەرەوەو بەخاكی بسپێرن، تا ئوتومبیلێكی ئیسعاف هات و بردی و لەشوێنێكدا نێژرا كەنازانرێ شوێنەكە كوێیە. (بۆ ئەم زانیاری‌یە نوێیانە سەبارەت بە ژیانی سەردار رەشید بروانە:)

ا-عیسی پژمان، كردها و كردستان، جلد سوم، سیاسی، پاریس، انتشارات ژن، شهریورماه، ١٣٣١ش، ص ٦٦

ب-یاسین خالد سردشتی، مجله (مەتین)، دهوك، عدد٨١، سنه، ١٩٩٨، ص١١٥،١١٦

(١٠) عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەكانی كوردو كوردو كۆماری عیراق، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٩، ل٧٦

## بەشی نۆیەم

# پەیوەندیو ناکۆکی نێوان خانیدزڵیو خانی کانیسانان

مەحمود خانی دزڵی سەردارو گەورەپیاوو نیشتمان پەروەری هەورامانی تەخت بوووەو دەسەڵاتی سەرتاپا گێڕی خۆی بەسەر ئەو ناوچانەدا بڵاوکردووەتەوەو دەچێتەوە سەر خێزانی (بارام بەگی).

(مەحمود خانی کانی سانان)(١)یش گەورە پیاوی دەست ڕۆیشتووی ناوچەی مەریوانو بەیەکێك لەشەخسییەتە دیارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ناسراوەو دەوری چالاكو ڕەزاسووکی خۆی لە ڕووداوە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ڕۆژگارەدا هەبووەو دەچێتەوە سەر تایەفەی حەیدەر بەگی، بەم جۆرە ئەم دوو سەردارە لەگەڵ (جافەر سانی لهۆن)دا خاوەنی تواناو دەسەڵاتی سەردەمی خۆیان بوون. لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەردوو خانی دزڵیو کانی سانان دۆستایەتییان بەتین بووەو زۆر جار بەهاوکاری یەکتر پەلاماری ڕژێمی ڕەزا شایان داوەو پێکەوە هاوکاری جووڵانەوەو ڕێکخراوە

نیشتمانی‌یەکانی کوردیان کردووەو لەم رێگایەشدا قوربانی‌یان داوەو تووشی گرتن‌و شەڕو دەردە سەری بوون‌و لەناوچەی ئازیزی خۆیان دوور خراونەتەوە(٢) بەلام چونکە ناوچەی دەسەلاتیان نزیکی یەك بوون‌و وەك نەریتێکی بۆ پێزی عەشایەری سەبارەت بەزۆر بوونی دەسەلات‌و زەوی‌و زارو بەرچاو تەنگی‌و لەهەمانکاتدا بەفیتی رژێمی ئێران هەندێ جار لەنێوانیاندا ناکۆکی‌و پشێوی ڕوویداوەو تەنانەت تەشەنەی سەندووەو گەیشتۆتە رادەی بەرانبەر یەك وەستان‌و هەریەکەیان لەشکری کۆکردۆتەوەو پەلاماری ناوچەکانی یەکتریان‌داوەو ئالۆزی‌و دەردی سەریان بۆ خۆیان‌و دانیشتوانی گوندەکان دروست کردووەو دوژمنی راستەقینەی خۆیان لەبیرچۆتەوە کەلەو کاتەدا (ڕەزاشا)و ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بووە.

ڕاستە ئەم دوو سەردارە بەجووتە لەسەرەتای بڵێسەی شۆڕشی یەکەمی شێخی نەمری بەردەقارەمانەوە وەك دوو پاڵپشتی گیان لەسەردەست بەخۆیان‌و سامان‌و عەشیرەتەکەیانەوە پشتیان گرتوو لەم پێناوەیشدا زیندانی‌و ئەرك‌و ئازاریان چەشتووەو بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی وەزارەتی‌دەرەوەی بەریتانیا باشترین شایەتی ئەم راستی‌یەن، جگە لە مانەیش لەکاتی ئاوارەیی‌و شکستی شۆڕشگێرانی کورددا پشت‌و پەنای ئاوارەکانی ئەو شۆڕشە نەتەوەیی‌یە بوون. (٣) بەلام بەداخەوە ئەم هاوکاری‌و دۆستایەتی‌و تێکەلاوی‌یە نەبووە تەهۆی بنەبڕکردنی ناکۆکی نێوانیان‌و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان.

دیارە هەریەکەیان وەك پابەندی سیستەمی دەرەبەگایەتی‌و خێلایەتی ویستوویانە بەئەندازەیەکی زیاترو مەودایەکی فراوانتر هێزو دەسەلاتی خۆیان بچەسپێنن بەتایبەتی لەگوندی (نژمار) کەئەکەوێتە ناوچەی مەریوان‌و لەدوو بەش پێکهاتووەو مەحمودخانی دزلی بەرێوەی بردووەو لەژێر فەرمانی‌دا بووە.

تەنانـەت شـێخی ئـەمر سـەرەرای سـەرقاڵیو دەربـەدەرییو خـەریك بونـی بـەکاروباری سیاسـەتو جـەنگو شۆڕشـەوە زۆر جـار بەنامـەی تایبـەتیو دانیشتنو گفتوگۆ لەگەڵیاندا هەوڵی داوە کە ئاگری ناحەزانەی نێوانیان بلێسە نەسێنیو ئـارامی روو لەناوچـەی هـەردووکیان بکاتـەوە، بـەڵام لەبـەر قوڵـی نـاکۆکیو بـەرژەوەندی تایبـەتی هەوڵـەکانی نەگەیشـتۆتە ئـەنجام. ئـەم مەسـەلەیەش دیاردەیـەکی تایبەتینییـەو تـەنیا بـەباڵای ئـەم دوو سـەردارەدا برابێ بەڵکو نەریتێکی رزیوی کۆنو دەست گرتنە بەداوێنی تیرەگەرێتی کـە بـەدرێژایی مێـژووی ژیـانو سـەرهەڵدانی کـورد هـەربووەو سەرچاوەکەیشـی دەسـەڵاتی تایبـەتیو چاوتیبرینیموڵكو زەوییو زارو فراوان کردنی ناوچـەی حوکمداری بووە.

ناکۆکی نێوان ئەم دوو پشتیوانە مەزنـەی شۆڕشی کورد کارێکی خراپـی کـردە سـەر رەوتـی خـەباتو بزوتنـەوەی رزگـاری خـوازی ئـەو رۆژگـارە تایبەتییەتی نەتەوەی کورد، چونکە لەکاتێکدا کە فەرمانرەوایانی ئینگلیزو کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی عیراق لەرۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٢٧دا هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر پێنجوێنو بەیارمەتی هێزی ئاسمانی ناوچەکەیان گرت کەبنکەو مەڵبەندی سەربازییو حەوانەوەی جەنگاوەرانی شێخی ئەمر بوو. لەم کاتەدا شێخ مەحمود لایەنگرانی کۆکردەوە بەنیازی شەرو تۆڵە سەندنەوەو دەرپەراندنی ئەو سوپا داگیرکارە. بەڵام لەم کارەدا شکستی هێناو نەی توانی بەرنامـەی کـاری بەئـەنجام بگەیـەنێو لەهۆیـە گرنگـەکانی ئـەم سـەرنەکەوتنە دەگەرێتەوە بۆ شەرو شۆری نێوان هەردوو خانی دزڵیو کانی سانان کەبەدوو پشتیوانی سەرەکی شۆڕشی کورد دادەنران.

ئـەم دوو سـەردارە لـەو کاتـەدا بەرامبـەر یـەکتر وەسـتابوونو لەشـەرێکی فراوانی خێڵەکیدا بوونو نەیان پەرژا دەستی کۆمەكو یارمەتی بۆ شێخی ئەمر

درێژ بکەن و سەرقاڵی ئاژاوەی نێوان خۆیان بوون و هێزەکانی دزلّی و مەریوان بۆ ئەو مەبەستە ناچیزەیە تەرخان کرابوو، سەرەرای ئەمەش رژێمی ئێران بۆ هاندانی ئاژاوەو دروست کردنی گرفتێکی تر بۆ شۆرشی کورد بەسوپایەکی فراوانەوە هەڵی کوتایە سەر ناوچەی مەریوان و ئەوروپشتی کە شوێنی حەوانەوەی خێزانی جەنگاوەرەکانی شێخی ئەمر بوو کەئەنجامی ئەم رووداوانەش مۆرکردنی نابەدڵی پەیمانی ١٩٢٧ی بەدواوە بوو کەبەناچاری لەنیوان شێخی ئەمرو کاربەدەستانی بەریتانیادا پێك هێنرا، لەساڵانی دواتریشدا هەردوو سەردار بەپلان و فرو فێڵی رژێمی ئێران کۆتایی بەژیانیان هێنرا، مەحمود خانی دزلّی بە ژەهر پێدان و خانی کانی سانان بەگرتن و زیندانی کردن و کوشتن، ئەوەتا رۆژنامەی (کوهستان)ی ژ٣٤ی رۆژی (١)ی کانوونی دووەمی ١٩٤٥ بەناونیشانی (چەند یادگارێکی تاڵ) هەواڵی کۆچی دوایی مەحمود خانی کانی سانان بڵاودەکاتەوە کە (لەچەند کیلۆمەتریك لە دووری یەکێ لەنەخۆشخانەکانی سیلداران لە بەرەبەیانی پێنج شەممەی ٢٧/١٠/١٣٢٤ی هەتاوی‌دا وەکوو قارەمانیکی مەریوان و کەسایەتی‌یەکی کۆمەلایەتی ناوچەکە غەمو پەژارەی خۆی دەردەبرێت و بەئاشکرا رەخنە لەسیاسەتی دەولەت دەگریت و هێرش دەکاتە سەر مشەخۆرو پیاوانی سەربازی کەلە ماوەی رابردوودا نەیان هێشت کەسانی‌وا بەئازادی لە ناوچەکەی خۆیاندا ژیان بەسەر ببەن و هەوڵ ئەدەن شیرازەی کۆمەلایەتی تێك بدەن).[٤]

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی نۆیەم:

(١) مەحمود خانی کانیسانانی سەردارو گەورەی مەریوان کەسایەتییەکی خاوەن دەسەڵاتو رۆڵەیەکی دڵسۆزو سەربەرزی رۆژگاری خۆی بووە، لەرووی خوێندەواری‌و بوارەکانی رۆشنبیرییەوە تا بڵێی ئاگادار بووەو ئەوانەی کەلەنزیکەوە ناسیویانە دەڵێن کە هەموو بەیانی یەك رۆژنامەو چاپەمەنییەکانی ئەو کاتەی بۆ هاتووەو لەبارودۆخی جیهان بێ ئاگانەبووە. نووسەر (نوری عەلی ئەمین) لەوتاریکی بچووکیدا بەناونیشانی دوو سەعات لەتەك مەحمود خانی کانی ساناندا) دەڵێ: مەحمودخان پیاوێکی بالابەرزیلاوازی کاکۆڵ زەردبوو. (بۆ ئەم وتارە بڕوانە: گۆڤاری رەنگین، ژ٢٩، بەغداد ١٩٩٢). مەحمود خان ساڵی ١٩٤٥ کۆچی دوایی کردووەو رۆژنامەی (کوردستان) هەواڵەکەی بڵاوکردووەتەوە.

(٢) سەبارەت بەپەیوەندی مەحمودخانی کانیسانان بەکۆمەڵە سیاسییەکانەوە زانای مێژوونووس دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لەچوار ئەڵقەی زنجیرە وتارێکیدا کەساڵی ١٩٩٦ لەگۆڤاری (رەنگین)دا بەناونیشانی (خێرو بێری راپۆرنوسێکی کورد) باسێکی مێژوویی گرنگو بەهاداری بڵاوکردووەتەوەو سەروەر پەیوەندی یان بەشێکی ئەوو مەحمود خانی کانیسانانو (کۆمەڵەی زەردەشتی)یەوە هەیە، دکتۆر لەئەڵقەی ژ (٢)ی گۆڤاری (رەنگین)ی ژ ٩٠ی ساڵی ١٩٩٦دا دەڵێ: (لەفایلی ژ٣٣/٤١٤ بەشی چوارەم، ئیکس-ئیم٤٥٨٢ی وەزارەتی فرۆکەوانی بەریتانیادا کەبۆ باسی بەشێك لەبزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٨و سەرەتای ساڵی ١٩٢٩دا تەرخان کراوە، دوونامەی دەستخەتی زۆر گرنگی تێدایەکە-کۆمەڵەی زەردەشتی-یەکێکیان ناردووە بۆ شێخ مەحمود لە پێرانو ئەوی تریانی ناردووە بۆ مەحمودخانی کانیسانان لەمەریوان.

راپۆرت نووسەکەمان کاری راستو خوای لێ رازی بێ بەرلەوەی نامەکان بگەیەنێتە شوێنی مەبەست هەردووکیانی گەیاندۆتە کاربەدەستانی ئینگلیز تاوێنەیان بۆخۆیان لێ بگرنەوە، ئینجا بۆ خۆی لوژلوژ بێ پەرواو بێ ترس رۆژی ٣٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٨ بەرەو پێرانو مەریوان کەوتۆتە رێ. نامەکەی شێخ مەحمود بەدەستخەتی جەلال سائیب نووسراوە کەبرای مستەفا سائیبی سەرۆکی لقی خۆیبون بوو لەسلێمانی. نامەکەی کۆمەڵەی زەردەشتی بۆ مەحمود خانی کانیسانان لەمەریوان بەزمانی فارسیو دەستخەتی مستەفا سائیب خۆیەتی. نزیکەی دوولاپەرەی قەوارە گەورەیە، دەقی ناوەرۆکەکەیشی ٥٣ دێری پڕ کردۆتەوە. لەسەرو نامەکەوە نوسراوە (ژ٢٤٨٦، رۆژ ی١٠ی ربیع الاخر ١٣٤٧) کەدەکاتە ٢٦ی ئەیلولی ١٩٢٨. لەدامێنی نامەکەشدا نووسراوە: صورەتیکی بۆ سکرتێرو موعتەمەدی عامی جەمعیەتی زەردەشتی لەبەغداد لەسەر ئەمرو تەحریراتی مەرکەزی عمومی ژ٢١٥٧ رۆژ ١٧ی سیپتەمبەری ١٩٢٨.

لەنامەکەدا بەگەرمی مەحمود خانی کانی‌سانان هان دەدات بۆئەوەی کۆششی بنوێنن تاسەرنجی ئیرانی‌یەکان بۆ بزوتنەوەی کورد رابکێشن. وێڕای ئەوەی خۆیشی وەك کۆمەڵەیەکی سیاسی کورد بەمەحمود خان دەناسێنێ. هەروەها کۆمەڵەی زەردەشتی وێنەیەکی لەنامەکەی خۆی بۆ شێخ مەحمود ناردووە بۆ مەحمودخان و ئەوەیشی پێ‌راگەیاندووە کەپڕچەری‌یەکان خەریکن خۆیان بۆ راپەرین ئامادەکەنەوە. پاش ماوەیەك راپۆرت نووسەکەمان لەپێران و مەریوانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و وەڵامی شێخ مەحمودو مەحمودخانی کانی سانان بۆ کۆمەڵەی زەردەشتی لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە. دیسان بەرلەوەی وەڵامەکان بگەیەنێتەوە شوێنی مەبەست دەیانباتە لای ئینگلیزەکان تاوێنەیان لەسەر بگرنەوە)

هەروەها دکتۆری مێژوو نووس لەئەلقەی ژ(٣)ی گۆڤاری (رەنگین)ی سالی ١٩٩٦دا نووسیویەتی:

(ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لەسلێمانی رۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٢٨ دەربارەی وەڵامەکانی شێخ‌رمەحمودخان یاداشتێکی بۆ ئیستخباراتی بەریتانی لەبەغدا ناردووە، کەوا پێ‌چونی راپۆر نووسەکەمان بۆ پێران و مەریوان و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی دەوروبەری مانگێکی خایاندووە، بەیاداشتەکەدا وادیارە مەحمود خانی کانی‌سانان خۆی لەداواکانی رابەرانی کۆمەڵەی زەردەشتی دزیوەتەوە، چونکە لەوەڵامەکەیدا هەرئەوەندەی راگەیاندووە کە نامەکەی وەرگرتووە. رابەرانی کۆمەڵە دەستیان هەڵ نەگرتووە، رۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٢٨ نامەیەکی تریان بۆ ناردووە، لەنامەی دووەمیاندا داوایان لەمەحمودخانی کانی‌سانان کردووە نوێنەری خۆی بنێرێتەلایان بۆ دامەزراندنی پێوەندی بەردەوام لەنێوان هەردولادا، وابێ دەچێ مەحمودخان ئەم نامەیەی خستبێتە پشت گوێ، یا وەڵامەکەی بەرێگەیەکی سەر راستدا ناردبێتەوە، چونکە ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لەسلێمانی لەیادداشتەکەی خۆیدا دەڵێ: هیچ وەڵامێکمان دەربارەی ئەو نامەیە پێ نەگەیشتووە.

بەپێی ناوەرۆکی نامەکان و زانیاری‌یە تایبەتی‌یەکانی ناو بەڵگەنامە تایبەتی‌یەکانی ئینگلیز وادەردەکەوێ سەرۆك و مەڵبەندی ناوەندی کۆمەڵەی زەردەشتی لەبەغداد بووبێ و کۆمەڵە دوو لقی بووبێ، یەکێکیان لەسلێمانی کەبەخۆی وتووە-شوعبەی فیدایی-ئەوی تریشیان لەهەولێر).

(٣)بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە:

زیوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی رۆژانی دەربەدەری، محەمەدی مەلا کەریم ئامادەی کردووەو پێشەکی بۆ نووسیوە، چاپخانەی-الادیب) بەغداد، ١٩٨٥،

(٤)سەبارەت بەرۆژنامەی کوهستان بڕوانە:

هیمداد حوسێن، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٥، ٢٢ی نیسانی ١٩٩٨، هەولێر.

## بەشی دەیەم

# خانیدزلی و جافەرسانی هەورامان

دانیشتوان و گەورە پیاوانی هەورامانی (تەخت)و (لهۆن) دەچنەوە سەر یەک بنەچەو خانەوادە کەئەویش (بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیار)[1]ەو دەبێتە باپیرە گەورەی فەرمان ڕەوایانی هەورامان.

لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە(مەحمود خانی دزلی) جڵەوی فەرمانڕەوایی (هەورامانی تەخت)ی بەدەستەوە بووەو بەچەشنی کەسایەتییەکی ناسراوو دەست ڕۆیشتووی نیشتمان پەروەر ناوی دەرکردووە.

لە (هەورامانی لهۆن) [2] یشدا (جافەرسان ١٨٨٥-١٩٤٢)[3] کە (مێژوو نووسەکان بە-جەعفەر سولتان -ناوی دەهێنن گەورەترین سەرۆک ئێڵی هەورامان بوو، هەر لەهەرێمی-هەمەدان-ی کوردستانی ئێران تاکو نزیک شاری -هەڵەبجە-ی کوردستانی عیراق لەژێر دەسەڵاتیدابوو) [4].

بەم رەنگە جافەرسان بەڕاستی سانی ئەو هەرێمە فراوانەبوو، لەسەردەمی میرنشینیو سەڵتەنەتی میرانو سانانی کورد، لەهەردوو کوردستانی ئێرانو بەشیعوسمانلی دا دەسەلاتێکی سەربەخۆیییان هەبوو) (*)

ناوی (جافەرسان) لەرۆژ هەلاتو باشووری کوردستاندا وەك نمونەیەکی دەسەلاتو بەرهەلستکاریو بەگژاچوونەوەی رژێمی ئێران هەردەم لەبەرچاو بووە. سالی ١٩١٢ بەرانبەر بەهێزەکانی (ئەحمەد شای قاجار)ی وەستاو جەنگاوەرەکانی ئۆردوی -ئەحمەد شا-یان هەتا دەورو بەری شاری (قەزوین) راوناو ئەم شەرەیش پێ دەوترێ (باغ شا).

دووسال دواتریش واتا سالی ١٩١٤ جافەرسان هێزەکانی تورکیای عوسمانی لەناوچەی هەورامان دەرپەڕان،

سالی ١٩٢٩ لەگەل هێزەکانی (رەزا شای پەهلەوی)دا کەوتە جەنگەوەو رژێمی ئێران هێرشێکی فراوانی کردە سەر هەورامانو بەو مەبەستەی کەچەکیان لێبسەنرێتو بەلام سەرکردەی هەورامان -جافەر سولتان-گوێی بەفرمانەکانی حکومەت نەداو نەی هێشت عەشیرەتەکەی چەك فرێ بدەنو بەم هۆیەوە لەناوچەی-روانسەر-لەگەل هێزەکانی ئێراندا کەوتە شەرەوە، بەلام لەئەنجامی زەبرو زەنگی سوپای ئێراندا ژمارەیەکی زۆر روویان کردە عیراقو-جافەر سولتان-یش تەسلیم بەدەسەلاتدارانی عیراق بوو، عیراقیش هەموو ئەو کەسانەی کەپەنایان بۆ بردبوو تەسلیمی ئیرانی نەکردنەوەو وەك پەنا بەرێکی سیاسی پاراستنیو -جافەر سولتان-یش لەشاری رومادی بەدەست بەسەری مایەوە) (٦).

لەلایەکی ترەوە جافەرسان لەرووداوە نیشتمانییەکاندا بێدەنگ نەبووەو بەشداری کردوە، بۆ نموونە لەکاتێکداو لەکۆتایی مانگی ئابی ١٩٣٠دا موتەصەریفی سلێمانی زانای خوالێخۆشبو (توفیق وەهبی) لەسەر کار لادەبرێتو دەگوێزرێتەوە، جافەرسان لەگەل جەماوەری کورددا داوای گەرانەوەیان کرد.

بروسکە: ١٩٢٠/٨/٢٦

بەغداد، فخامە مندوب السامی

(رئیس الوزراء)

گۆرینی موتەصەریف تۆفیق وەهبی بەگ ئەبێ بەسەبەبی تەئەثوری عمومی کوردان، رجا ئەکەین ئیعادەی بفەرموونەوە

رەئیسی هەورامان

جەعفەر سوڵتان

رۆژنامەی ژیان: ژ٢٥٩

رۆژی ٤ی ئەیلولی ١٩٢٠

بروسکە: ١٩٢٠/٨/٢٤

فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆ فەخامەتی (رئیس الوزراء)

تەبدیلی مەتەصەریف مەغایری ئەفکارمان وسەبەبی تەئەثوری عمومی کوردانە، ئیسترحام ئەکەین زوو ئیعادەی بفەرموونەوە:

هەورامان: ئەفراساب بەگی رۆستەم سوڵتان

هەورامان: مصطفی بەگی جەعفەر سوڵتان

هەورامان: محمەد ئەمین بەگی مەحموود خانی دزلی

هەورامان: شیخ محەمەدی شێخ حیسامەدین

رۆژنامەی ژیان: ژ٢٥٩

رۆژی ٤ی ئەیلولی ١٩٢٠

گەر سەیری هەندێ لەبەڵگەنامە مێژوویەکان بکەین‌و چەند لاپەڕەیەکی ئەو راپۆرتانە هەڵبدەینەوە دەبینین کەناوی ئەم دوو سەردارە زۆر جار دەبینرێن، لەراپۆرتی (هەندێ سەرنج سەبارەت بەخێڵەکانی باشووری کوردستان لەنێوان زابی گەورەو دیالەدا کەساڵی ١٩١٩ بەزمانی ئینگلیزی چاپکراوە) [٧] دەربارەی مەحموود خانی دزلی دەڵێ:

(مەحموود خان لەیاخی بووە کانەو ئەم پیاوە لەدژی ئێمەیەو پاڵپشتی‌شێخ مەحموودە)[٨] بەڵام سەبارەت بە جافەرسان بەم جۆرە دێتە باس کردن:(جافەرسان هەمیشە ناکۆکی لەگەڵ تورکەکاندا هەبوو، نەبوو بەپاڵپشتی شێخ مەحموود)[٩].

ئیمە لێرەدا ئەم بەڵگەنامەیەمان بەو مەبەستە خستە بەرچاو تابەرروونی پێناسەی سیاسی‌و هەڵس‌وکەوت‌و رێڕەوی هەردووکیان لەو رۆژگارەدا بزانرێت کە تابلۆی رۆژگاریکی جەنجاڵ‌و هەر کەسەیش سەر بەبەرەیەکی تایبەتی بوو.

ئەم دوو سەردارە بەدەسەلاتە بەهۆی زەوی‌و زارو موڵك‌و بگرە دواکەوتوویی سیستەمی کۆمەڵایەتی‌و دەرەبەگایەتی‌و لەلایەکی ترەوە بەهاندان‌و فیتی رژێمە بەکرێگیراوەکانی ئەو سەردەمە زۆر جار ناکۆکی‌و پشێوی لەنێوانیان‌دا رووی‌داوەو هەندێ جاریش خوێنی ئاڵی یەکتریان رشتووەو دواتر رێك کەوتوونەتەوە بەڵام ناخۆشی‌و ئاڵۆزی‌یەکە لەدڵدا هەر ماوە.

(لەیەکێك لەو هێرش‌و پەلاماردانەدا جەنگاوەرەکانی خانی دزلی هاتوونەتە دیوی هەورامانی لهۆن‌و گوندی -هانەگەرمەڵە-یان سووتاندووە کەسەربە جافەرسان بووە، لەم شەرەدا ژمارەیەکی زۆری هەردوولا کوژراون، بۆنموونە لەریزی کوژراوەکان‌دا -حەمەبەگی برای مەحمودخانی دزلی-و-مەجید بەگی

بانی شار-ی دەبن کەئەم مەجید بەگە لەئازایەتی و جەربەزەیی‌دا ناسراوبوو بە-گورگەبۆر-و (تەنانەت لەنزیك گوندی -ئەحمەدئاوا-دا جێیەك هەیە پێی دەڵێن - زیارەتی هەورامی-کە کوژراوەکانی ئەو شەرە خویناوی‌یە لەوێدا نێژراون)و دوایی ڕێك کەوتوونەتەوەو (لەتۆڵەی حەمەبەگی برای مەحموودخان‌دا دووکچی هەورامانی لەوێن دراون بەهەورامانی تەخت، یەکێکیان ئامینە خانی کچی جافەرسانەو دراوە بەعەبدوڵلاخانی دزڵی و ئەوی تریان ئایشەخانی کچی ئەفراسیاب بەگی سەرگەتەو دراوە بەحەمەئەمین بەگی برای مەحموود خان) [11]

دیارە ئەم کارەشیان وەك دەستوورو نەریتێکی عەشایەری بەو مەبەستەبووە کەبەم ڕێگایە چارەسەری دوژمنایەتی و ناکۆکی‌یەکە بکرێت و سەرلەنوێ خزمایەتی و دۆستایەتی لەنێوانیان‌دا ببوژێتەوەو خوێن ڕشتن بنەبڕبکرێت.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی دەیەم:

(١) بڕوانە: محەمەد بەهادین ساحیب، پێشالیاری زەردەشتی، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٦٨ل١٢.

(٢) بەشی زۆری دێهاتەکانی هەورامانی لهۆن دەکەونەباشووری ڕۆژئاوای ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە، بەشێکی کەمیشی سەربە باشوری کوردستانە.

(٣) جافەر سولتان ١٨٨٥-١٩٤٢ کوری محەمەد سەعید سوڵتانی کوری عوسمان سوڵتانی کوری عەلی موراد سولتانی کوری مونمن خانی کوری وەلی بەگی کوری عەباس قلی‌بەگی کوری فەتح عەلی سولتانە، سالی ١٨٨٥ لەدایك بووەو سالی ١٩٤٢ لەتەمەنی ١٠٨ سالیدا کۆچی دوایی کردووەو لەگۆرستانی عەشیرەتەکەی لە عەبابەیلێ نێژراوە، جافەر سولتان بیست کوری هەبووەو بەزۆری لەناوایی (نەوسود)دا دەنیشت.

(٤) دکتۆر موکەرەم تالەبانی: وتاری (چەکێك لەمێژووی جافەرسانی هەورامان) گۆڤاری رەنگین ژمارە ٥٧ سالی ١٩٩٣، لەم باسە مێژوویی‌یەدا دکتۆر موکەرەم بەرەو دەگەرێتەوە بۆ دەورووبەری سالی ١٩٣٢ کە جافەرسان لەگەل هەندێ لەکوڕو کەس و کاریدا روودەکەنە تەکیەی تالەبانی لەکەرکوك و دەلێت (جافەرسان پیاوێکی بێ فیزو قسەخۆش و قسەزان بوو، بەپێچەوانەی مەحموود خانی دزلی کە کەم دووبوو). لەراستیدا ئەم باس و بیرەوەرییەی دکتۆر لاپەرەیەکی بەهادارو بیرەوەرییەکی مێژوویی گرنگە.

(٥) هەمان سەرچاوەی پیشوو.

(٦) د.ولید حمدی، الکرد وکردستان في الوثائق البريطانية، مطابع سجل العربي، ١٩٩٢ص٢٩٧.

(٧) ئەم راپۆرتە لەلایەن نووسەرو جوگرافیازانی ناسراو دکتۆر فوئاد حەمە خورشیدەوە کراوە بەعەرەبی: بروانە: العشائر الكردية، ترجمة فؤاد حمة خورشيد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩.

(٨) نفس المصدر،ص ١٦.

(٩) نفس المصدر،ص١٥.

(١٠) ئەم زانیارییانە سەبارەت بەشەری (هانەگەرمەڵە) لەو شریتەوە وەرگیراوە کەمامۆستای مێژوونووس عەبدورەقیب یوسف رۆژی ١٩٨٤/٦/٢٦دا چاوپێکەوتنێکی لەگەل شێخ ئەمینی نەقشبەندیدا سازکردبوو، بەلام لەقسەکانی شیخ ئەمیندا باسی حەمەبەگی کوری مەحموودخان نەکرابوو، ئەمەیان ئەنوەر بەگی کوری مەحموودخان پێی راگەیاندم.

(١١) ئەم زانیارییانەم لەئەنوەر بەگی مەحموودخانی دزلی وەرگرت.

## بەشی پانزەیەم

# لەنێوان خانی دزڵیو حەمە رەشیدخانی بانەدا

خانی دزڵی وەك كەسایەتی یەكی بەدیمەنو خاوەن تاقیكردنەوەی ژیانو قاڵبووی رووداوەكانی رۆژگار، بەردەوام لەكاروكۆششی دلسۆزانەدا بووە بۆ بەتین كردنی پەیوەندیو برەوپێدانی گیانی برایەتیو دۆستایەتی لەگەڵ سەرۆك هۆزو گەورە پیاوانی سنووری دەسەڵاتی، لەرێی ئەم پەیوەندی یە توندوتۆڵەیشەوە توانیوێتی تارادەو ئاستێكی باش كاروباری ژیانی خۆیو دانیشتوانی سەقام گیر بكاتو بەرانبەر بەهێزی ستەمكاران بووەستێو خۆیو عەشیرەتو جەنگاوەرانی لە شكستو نەهامەتی بپارێزێ.

بەڵام وەنەبێ توانیبێتی كە ئەم بەرنامە پیرۆزەی ژیانی لەهەموو كاتێكدا پەیرەو بكاتو هەوڵو كۆششی بەربگرێ، بۆیە هەندێ جارو بەبێ ویستی خۆی بەرەو رووی شەڕو پەلامارو ئاژاوە چووەو لەم كاتانەیشدا شێرانە جەنگاوە.

یەكێك لەو كوردە جەربەزە خاوەن دەسەڵاتانەی ئەو رۆژگارە كە لە باشوورو رۆژهەڵاتی كوردستاندا دەوری كارای بووەو لە بزووتنەوەكانی كوردو مەسەلە نیشتمانی یەكاندا تێكەڵی رووداوەكان بووەو حیسابی تایبەتی بۆ كراوە (حەمە رەشید خانی بانە)[1] بووە.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ مێژوویەکی بەرفراوانی سەرەتاو بنەتای ژیانو بەسەرهاتو خەباتو شکستو کۆششی ورد بکەینەوەو لەم بارەیەوە باسێکی پراو پڕو سەرتاپاگیر بخەینە بەرچاو، چونکە ئەم باسە پێویستی بە مەودایەکی بەرین ترو لێکۆلینەوەو بەدواداچوونی زیاتری دەوێ، بەلام هێندە دەلێین کە لاپەڕەکانی ژیانی سەر ڕێژن لە شەرو بزوتنەوەو ڕاپەڕینو رازی نەبوونو بەرەنگاری بوونەوە، لێوان لێون لەخەباتو وەستان بەرانبەر رژێمی داگیرکاری ئێرانو هاوکاری کردنو دەوربینین لە دەولەتی جەمهوری کوردستاندا لەم پێناوەیشدا گرتنو دەربەدەریو ئاوارەییو پەنابەرێتی سیاسی لاپەڕەیەکی تری ژیانی داگیرکردووە.

خانی دزلێو حەمە ڕەشید خانی بانە دوو هاوکاری یەکتر بوون، لەنێوانیاندا درستایەتیو برایەتیو پشتی یەك گرتن لە ئارادا بووەو پەیوەندی نێوانیان بەتین بووە، تەنانەت لەکاتێکدا کە خانی دزلێ لەگەڵ دراوسێو سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەری دەسەلاتیدا بەرانبەر بەیەك وەستاون زۆر جار حەمە ڕەشید خان پالپشتی خانی دزلێ بووە.

لەکاتێکدا کە حەمە ڕەشید خان لە سالی ۱۹٤۰دا دەسەلاتیکی خۆجێیەتی کوردی لەناوچەکانی بانەو سەردەشتو سەقزدا دروست کردبوو، لەپایزی ئەو سالەدا بۆ جاریکی تر ناکۆکی نێوان خانی دزلێو خانی کانی ساناندا دروست بووەوەو ئەمەیش لە ئەنجامی مولکو زەویو زاری ناوچەکە بوو، (لەم کاتەدا حەمە ڕەشید خانی بانە بەهێزیکی ۵۰۰ کەسییەوە بەسەرکردایەتی -حەمە ئەمین خان-ی برای ناردەسەر شاری (مەریوان)و بۆ کۆمەکی خانی دزلێو سەندنەوەی مافە زەوت کراوەکان کە دەکەوتنە ناوچەی هەورامانو سنووری شارستانی مەریوان، سەرئەنجام کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی سالی ۱۹٤۱ شاری مەریوان گیراو هیزەکانی دەولەت بەرەو شاری سنەو پاشەکشەیان کردو مەحمود خانی کانی سانان یش بەرەو سنە ڕۆیشتو شاری (مەریوان)یش لەڕووی ئیدارییەوە بەدەسەلاتەکەی حەمە ڕەشید خانەوە بەسترایەوە)[٢].

بەماوەیەکی کەم لەدوای ئەم ڕووداوە رێك (لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ۱۹٤۱دا رژیمی ئیران بەفرۆکە بوردومانی ناوچەکانی باکورو ڕۆژئاوای ئێرانی کردو بەیاننامەی لەو ناوچانەدا بلاوکردەوە و هێزەکانی حەمە ڕەشید خان ٢٠ میل بەرەو باکوورلەناوچەی سەقز کشانەوە)[٣].

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی پانزەیەم:

١-حەمە ڕەشید خان کوڕی قادر خانی کوڕی عەبدوڵلا بەگی کوڕی بارام بەگی کوڕی سلێمان بەگی بانەیە. سالی ١٨٨٩ی زایینی لەگوندی (شیوی گوێزان) لەدۆلی شلێر لەدایك بووە، سالی ١٩٢٥ بەخۆی‌و کەس‌و کاری‌یەوە سوپایەکی چەند هەزار کەسی ئێرانی لەگوندی (وێنە) دەشکێنێت کە تیایدا هۆزەکانی مەنگورو دیبوکری‌و مامەش هاوکاری سوپای ئێرانیان کردبوو. لەسالانی (١٩٢٦-١٩٣٠) بەهاوکاری هۆزو بەگزادەکانی بانەو سەقز پەلاماری دەسەلاتدارانی ئێرانیان داو لە ئەنجامی ئەم کارانەیش دەولەتی عیراق بۆ ماوەی دوو سال دووری خستەوە بۆ شارەکانی موسل‌و ئامێدی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ سالەکانی (١٩٣٠-١٩٣٢).

لەسالانی ١٩٤١- ١٩٤٤ توانی شارەکانی بانە، سەقز، سەردەشت، مەریوان، دیواندەرە، ئازاد بکات‌و دەسەلاتێکی سەربەخۆیی تیا دابمەزرێنێ. سالانی ١٩٤٤-١٩٤٥ دوورخرایەوە بۆ سلێمانی. سالی ١٩٤٦ بەشداری دەولەتی جەمهوری کوردستانی کردو پلەی ژەنەرالی پێدراو کرا بە فەرماندەی هێزەکانی بۆکان‌و بریکاری وەزیری جەنگو لە ١٩٤٦/٨/٢ وازی لێ هێنا.

سالانی ١٩٤٦-١٩٥٠ بۆ شاری ڕومادی دوورخرایەوە.

سالانی ١٩٥٠- ١٩٥٨ بۆ شاری کەرکوك دوورخرایەوە.

سالانی ١٩٦١-١٩٧٤ بەشداری شۆڕشی کوردستانی کرد. لە ١٩٧٤/١٢/٤دا لە گوندی داروخان کۆچی دوایی کرد (ئەم ژیاننامەیەم لەگەل وینەیەکدا لە کەیوان ئازاد ئەنوەر وەرگرتووە).

٢-ئەم زانیاری‌یانەم لە (کەیوان ئازاد ئەنوەر) وەرگرتووە.

٣-د. ولید حمدی، الکرد وکردستان في الوثائق البریطانیة، مطابع سجل العربي، ١٩٩٢ ص٤٠٨.

## بەشی دوانزەیەم

# دزڵی و مەریوان و ئاوارەکانی شۆڕشی شێخ مەحموود

لە دوای شکست و پەرەوازەبوونی هەردوو حوکمداری یەکەی شێخ مەحموود کە یەکەمیان بە جەنگی دەربەندی بازیان و بریندار بوون و گرتن و حوکمدان و دوورخستنەوەی کۆتایی هات، دووەمیان دوای دەست بەسەری هندستان و دامەزراندنی کابینەیەکی نوێ بە ناوی (تەشکیلاتی حوکومەتی کوردستان) و دواتر چۆڵکردنی شاری سلێمانی و ڕووکردنە ناوچەی سورداش و (ئەشکەوتی جاسەنە) لە شەوی ٣|٤ی مارتی ١٩٢٣دا و جارێکی تر هاتنەوەی شێخی ئەمر لە١١ی تەموزی ئەوساڵەدا و دواجار کشانەوەی لەشاری سلیمانی لەناوەڕاستی ١٩٢٤دا. لەم هەموو بارودۆخە ناهەموار و پڕمەینەتی یەدا خێزان و کەس و دۆست و لایەنگرانی شێخی ئەمرو شۆڕشی کورد بەلێقەوماوی یەوە بەرەو ناوچەکانی دزڵی و مەریوان بەرێ کەوتوون و مەحموودخانی دزڵی و مەحموودخانی کانی سانان بەهانایانەوە چوون وەك دوو شەخسی یەتی دڵسۆز لای خۆیان جێیان کردوونەتەوە و دالدەیان داون ولەمەترسی و نەبونی و بێشوێنی دووریان خستونەتەوە .

(زێوەر)[١]ی شاعیر سەبارەت بەکارەساتی دوای جەنگی دەربەندی بازیان کەخۆیشی یەکێك بووە لەئاوارەکانی ئەو شۆڕشە لەیادداشتنامەکەیدا بەوردی لەو ڕۆژانە دواوە کەچۆن بەشێرەزەیی و سەرگەردانی‌یەوە بەشارو ئاوایی‌یەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا سوڕاونەتەوەو بەپەرێشانی و ئەلهاوە چاوەڕوانی کۆمەك‌و دەست گیرۆیی پیاوە ناودارو دڵسۆزەکانی ئەو ناوچانە بوون‌و دوای ڕاوێژی هەردوو خانی‌دزلی و کانی سانان بڕیار دراوە کە ئایشەخانی حەرەمی شێخ مەحموودو[٢] شێخ عەبدولـلای ئامۆزایی[٣] و سەید ئیبراهیمی برایی[٤] و شێخ لەتیفی‌کوڕی‌و[٥] حسێن ناظم‌و[٦] چەند کەسێکی تر بەرەو ئاوایی دزلی بەڕێ بکەون‌و ئاوایی‌یەکانی میر مەحموود خانی‌دزلی ببێتە جێی حەسانەوەیان، بەلام بەهێ‌خانی حەرەمی شێخ مەحموودو(٧) شێخ ڕەئوف‌و شێخ باباعەلی کوڕانی شێخ‌و کاکەحەمەی ئەمینی عەتاری خاڵیان‌و خوشکێکی شێخ مەحموودو زێوەرو هەندێکی تر لەئاوایی (دەرزیان)ی سەر بەمەحموود خانی‌کانی سانان دەمێننەوەو لەو ماوەیەدا جێی ڕێزو میهرەبانی ئەو دوو سەردارەی کورد بوون.

بەلام زۆری نەخایاند کەهەردوو خانی دزلی و کانی سانان لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە بەپێی داواکاری و پلانی ئینگلیزەکان بەفێڵ دەگیرێن‌و ڕەوانەی تاران‌و لەوێشەوە بەرەو بەغداد ڕەوانە دەکرێن، دیارەئەم ڕووداوەیش هێندەی تر کێشەی ئالۆزو مەینەتی و گرفت بۆ کەس‌و کارو بنەماڵەی شێخی ئەمرو ئاوارەکانی شۆڕشی کوردزیاد دەکات‌و بێ پشتیوان دەمێننەوەو دەبێتەهۆی نائومێدی و پەرەوازە بوونیان‌و هەر ڕۆژەی لەکوچەو پەنایەکدا داڵدەدران.

جگە لەهەردوو خانی دزلی و کانی سانان خوالێخۆشبوو (سەید عەبدولقادری دۆزەخدەرە ١٨٧٢-١٩٥٧/١٢/٢٣)[٨] و بنەماڵەکەی لەگوندی- دۆزەخدەرە-ی سەربەشاری سەقز یاریدە یەکی باشی ئاوارەکانیان داوەو دوای تێکشاندنەکەی دەربەندی بازیان بەهانایانەوە چوون‌و نەوازشێکی زۆریان لێکراوە.

دوای گەڕانەوەی شێخی ئەمر لەهیندستا ن و دامەزراندنی حوکومەتێکی نوێو دواتر گرژیو پشێویو تێکچوونی کوردەکان لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیزداو بۆردومان کردنی شاری سلێمانیو چۆڵ کردنو ڕەو کردن بەرەو دزلی سورداشو ئەشکەوتی جاسەنەو بۆجارێکی تر سەرجەم خێزانو بنەماڵەی شێخ مەحموود ڕوویان کردەوە ئاوایی دزلیو ناوچەی هەورامانی تەخت بووە پەناگەی ئاوارەکانی شۆڕشی کورد.

سەبارەت بەدالدەدانو خزمەتگوزاری خانی دزلی بۆ خێزانو بنەماڵەو ئاوارەکانی شۆڕش لەهەموو باروودۆخێکی شکستو ناهەمواریدا شێخ باباعەلی شێخ مەحموود دەڵێ: (دوای ئەوەی باوکم بڕیاریدا سلێمانی بەجێ بهێڵێتو ڕووبکاتە ئەشکەوتی جاسەنە بۆ ئەوەی بیانوو نەداتە دەست ئینگلیزەکان بەفڕۆکە ناو شار وێران بکەن، سلێمانییان بەجێ هێشتو هەر تاقمە ڕووی کردە شوێنێکو جارێکی تریش خێزانەکانی شێخانو خزمانو ناسیاوو دەستو پێوەند بارمان پێچایەوەو ڕوومان کردە ناوچەی دزلی هەورامانو لەهاوینە هەواری -هانەسابە-ماینەوە هەتا ئینگلیزەکان جارێکی تر سلێمانییان بەجێ هێشتو ئەوسا گەڕاینەوە)[٩].

-ئەحمەد خواجا-یش لەبارەی مەینەتی ئاوارەکانی شۆڕشی شێخ مەحموود دەڵێ: (شێخی ئەمر فەرمووی: خێزانەکان هەموویان لەپاڕەزان جێیان نەدەبووەوەونێرران بۆ دزلیو بچۆ جێگەو ڕێگەیان ببینەو دایکیشت دەبینیو ئەم نامەیەش بدەبەدێوەکەو لەئەشکەوتەکە دەری بهێنەو نامەکەیشی بەدەستی خۆی نووسیبوو)؛

برای دڵسۆزم مەحموود خان:

چاوەکانت ماچ ئەکەم، وامەزانە ئاوارەو لێقەوماوین، ئێمە لە ناو کەس‌و کارماندا دەژین کە ئێوەن. ئەحمەدە فەندیم راسپاردووە کە هەموو گفتوگۆیەکتان لەگەڵدا بکات. چاوی کورەکان ماچ ئەکەم، حورمەتم بۆ خوشکی خۆم فاتمە خان پێشکەشە برای شیرینم[10]

مەحموود

١٠ی ئەیلوول ١٩٢٤

دیارە ئەم نامەیەی شێخی نەمر بۆ سەرداری هەورامان میر مەحمود خانی دزڵی دەگەرێتەوە بۆئەو رۆژانەی کە شێخ مەحموود دوای حکومەتی دووەمی کوردستان سلێمانی بەجێ هێشت‌و سەرلەنوێ دەست کرایەوە بەشەڕو خۆسازدان‌و زیادکردنی جموجوڵی سوپاو هێزی هەوایی ئینگلیزەکان.لەلایەکی ترەوە هەندێ لەخێزانەکان لە-گەڵاڵە-ی ماوەتەوە نێرران بۆ دزڵی‌و (٥٠) سوار لەگوندی-حاجی مامەند ی سەربەناحیەی بەرزنجە ڕوویان کردە ئاوایی سەرکان‌و کاتێ مەحموودخان بەمەی زانی خۆی‌و جەنگاوەرەکانی هاتبونە سەرکان‌و خێزانەکانی ڕەوانەی دزڵی کردن.

خواڵێ خۆشبوو شێخ باباعەلی شێخ مەحموود دەڵێت:

لەساڵی ١٩٢٦دا کەسەرەتای ئاڵ‌و گۆڕکردنی نامەی نێوان باوکم‌و ئینگلیزەکان دەستی پێکرد، باوکم ئەوکاتە مەرجەکانی بەدڵ نەبوو کە ئینگلیزەکان بڕیاریان لەسەردابوو،بەڵام ئەوەی کەباری شۆڕشگێرانی کوردی

ئاڵۆزکرد ئەوەبوو لەبەهاردا-ڕەزاخـان-هـێزێکی سوپای گەورەی ئێرانی کـردە سەر مەریوان و گرتی و لەوکاتەدا خێزانە ئاوارەبووەکان لەهەواری (کانی برنـج) بـوون و لـەدوای داگـیر کردنـی مـەریوان ئـەو خێزانانـە هـەموویان ناچـاربوون کەڕوویکەنـە هەورامان، سوپای عیراق و هـێزی لیڤی ئاسوریش ڕوویـان کـردە چوارتـاو لەسـەر شـاخی-ئەزمڕ-شـەڕێکی قورس ڕوویدا لەنێوان ئـەوهێزەو هـێزی کورددا کەزۆربـەیان لەعەشیرەتی -بێسـەری-ناوچەی شـاربازێڕ بـوون و لـەو شـەڕەدا موفەتیشـێکی عەسـکەری لەگـەڵ سـەربازێکی زۆردا کـوژران و بریندار بـوون، بـەڵام شـێخ مـەحموود لەبـەر نـەبوونی تفاقی شـەڕ وەکوچـەك و جبەخانـەو ئازووقـە ناچاربوو هێزەکـەی بکشـێنێتەوەو ئینگلیزەکـان -ئـەمین بەگی قامیش-یان کرد بەقائمقامی چوارتاو-سەید ئەحمـەدی حـاجی مامـەند-یش کرا بەمودیری ناحیـەی سروچك و دووبـارە مـەحموود خـانی دزڵـی ئەرکی ئـاوارەو چـەکدارەکانی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی کەبـەناچاری ڕوویـان کردبـووە ناوچەکەی ئەو)(١١).

لێرەداو لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم بەڵگـەو لێدوانەمێژوویی‌یانـەدا زیـاتر ڕوون دەبێتـەوە کە چـۆن مـەحمود خـانی دزڵـی وەك خـەمخۆرێکی دڵسـۆز هەمیشـە پشت و پەنای شۆڕشی کورد بووە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی دوانزەیەم:

(١)خوالێ خۆشبوو-زێوەر-ی شاعیر کەخۆی یەکێك بووە لەئاوەرەبووەکانی شۆڕشی شێخی ئەمر بەدرێژی‌یەو دەربەدەری‌یە دواوە کەلەدوای جەنگی دەربەندی بازیان و شکستی شۆڕشەکە تووشی هاتوون و لەم بارەیەوە گەلێ شتی وردی مێژوویی ڕوون کردووەتەوەو بۆ ئەمەیش بڕوانە: گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، محەمەدی مەلا کەریم ئامادەی کردووەو پێشەکی بۆ نوسیوە، چاپخانەی الادیب، بەغدا، ١٩٨٥.

(٢)مەبەست لەئایشەخانی شێخ مارفی نەقیب و هاوسەری دووەمی شێخی ئەمرەو دایکی شێخ لەتیفە، ئایشەخان خوشکی گەورەی حەپسەخانی نەقیبە کەهاوسەری شێخ قادری حەفید بووە، ئایشەخان پێشتر هاوسەری شێخ ئەحمەدی برای شێخی ئەمربووە.

(٣)مەبەست لە-سەید عەبدوڵڵا-ی حاجی سەید حەسەنە کەئامۆزای شێخ مەحموود بووە.

(٤)سەید ئیبراهیم لەباوکەوە برای شێخ مەحموودو لەدایکەوە جیان.

(٥)شێخ لەتیف کوڕە بچوکی شێخ مەحموود بووە، ساڵی ١٩١٧ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، ساڵی ١٩٣١ لەتەمەنی چواردە ساڵیدا بەشداری شەڕی ئاوباریکی کردووە، بەدرێژایی ژیانی شۆڕە سوارێکی نەبەردی ڕێگای خەبات و کوردایەتی بووەو، بەوهۆیەوە زنجیرەیەك دەربەدەری و سزاو بەندیخانەی بینیوەو بەگەردن کەشی ماوەتەوە، ساڵی١٩٥٦لەلایەن حوکومەتی پاشایەتی‌یەوە دەگیرێ و تاشۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ لەبەندیخانەدا دەمێنێتەوە، ڕۆژی هەینی کات ژمێری شەش و نیوی ئێوارەی ڕێکەوتی ١٩٧٢/٥/١٢ لەنەخۆشخانەی (الراهبات)ی بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لەمزگەوتی گەورەی سلێمانی بەخاك سپێردراوە، شێخ لەتیف لەبواری شیعرو ئەدەبدا دەستێکی باشی هەبووەو ساڵی ١٩٧٥کۆمەڵێ لەشیعرەکانی بەناوی گوڵی وەریو بەهەوڵ و کۆششی حەلاوەخانی هاوسەری چاپکرا.

(٦)حسێن ناظم کوڕی -عبدالفتاح-ە فەندی کوڕی- وەستا ئەحمەد-ی باش خەیاتە، باپیری بەرگدرووی بابانەکان بووە، ساڵی ١٢٨٠ی ڕۆمی کەئەکاتە ١٨٦٤ی زایینی لەگەڕەکی کۆیژەی شاری سلێمانی لەدایك بووە، لەسەرەتادا بنەماکانی فارسی و تورکی و عەرەبی لەلای (خواجا فەندی) خوێندووەو کەرەستەیەکی باشی ڕۆشنبیری دەست کەوتووە، لەسەردەمی حوکومەتی یەکەمی شێخ مەحموودی حەفید زادەدا ڕاوێژکاری شێخی

نەمربووەو بووەتە جێی برواو متمانەی، دوای جەنگی خوێناوی (دەربەندی بازیان) لەگەڵ چەند کەسێکی دیارو خزمو بنەماڵەی شێخ مەحموود سلێمانی بەجێ دەهێڵن‌و ڕوودەکەنە ڕۆژهەڵاتی کوردستان‌و دەبنە میوانی سەرداری هەورامان مەحموودخانی دزڵی‌و ماوەیەک لەوێ دەمێننێتەوە.

حسێن ناظم لەژیانی‌دا چەند جارێك کراوە بەبەڕێوەبەری ناحیەی سروچك‌و مەرگەو ماوەت. دوای چۆڵکردنی سلێمانی بۆجاری دووەم حسێن ناظم بەرەو تورکیا دەکەوێتە ڕێو پاش ماوەیەك لەوێ دەکرێ بەقایمقامی شەمزینان‌و ماردین‌و دیاربەکرو باشقەڵا.

ساڵی ١٩٢٥ دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی‌و ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژ٤٦ی ساڵی دووەمی ڕۆژی ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ هەواڵی گەڕانەوەی بڵاوکردووەتەوە.

حسێن ناظم لەریزی پێشەوەی روناکبیرە بەدیمەنەکانی کوردە، ساڵی ١٩٢٣ دەبێتە بەڕێوەبەری نوسین‌و سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال)و چەند بابەتێکی سەبارەت بەنەتەوەی کوردو بارودۆخی ئەوسەردەمەی بەتورکی‌و فارسی بڵاوکردووەتەوە، ساڵی ١٩٢٩ دەبێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژیان)و تاکۆچی دوایی بەبەڕێوەبردنی ڕۆژنامەکەوە خەریك دەبێ.

حسێن ناظم سەرەڕای کاری نیشتمانی‌و ڕۆژنامەنووسی یەکێکە لەمێژوو نووسە پێشڕەوەکانی دەستەی یەکەمی مێژوونووسانی کوردو کۆمەڵێ بەرهەمی مێژوویی دانسقەی وەك (مێژووی بابان)و (مێژووی ماوەت) نووسیوەو بەڵام بەداخەوە زۆری بەرهەمەکانی لەوتاوون

ئەم روناکبیرە لەشەوی٥\٦ی مانگی مایسی ساڵی١٩٣٢دا کۆچی دوایی دەکات‌و (پیرەمێرد)ی شاعیریش لەژ٣٢٢ی ڕۆژی ١٩ی مایسی ١٩٣٢ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بەنووسینێکی بەسۆزمالئاوایی لەوهاوڕێ دڵسۆزەی دەکات.

لەنەوەکانیشی مامۆستا (سامی) کوڕی نزیکەی نیوسەدە لەبواری پەروەردەو فێرکردن‌و زانست‌و بەڕێوەبردن‌و کاری دڵسۆزی‌دا بۆ نەتەوەکەی کاراترین دەوری شکۆیی‌و راستگۆیی بینی.

(٧)مەبەست لەبەهێ خانی ئەمینی عەتاری هاوسەری‌یەکەمی شێخ مەحموودو دایکی شێخ رەئوف‌و شێخ باباعەلی‌و حەلاوەخانە.

(٨)خوالێخۆشبوو (سەید عەبدولقادری دۆزەخدەرە-١٨٧٣-١٩٥٧/١٢/٢٣) دانیشتووی ئاوایی-دۆزەخدەرە-ی سەربەشاری- سەقز-ی رۆژهەلاتی کوردستان کوڕی سەید محەمەدی کوڕی سەید ئیسماعیلی دووەمە- ئەم بنەماڵە ئایین ناس و کورد پەروەرە لەرۆژگارو ژیانی باوو باپیریانەوە پەیوەندییەکی نەپساوو دۆستایەتییەکی توندو تۆڵیان لەگەڵ بنەماڵەی ناسراوی (حاجی کاک ئەحمەدی شێخ ١٧٩٣-١٨٨٧)دا بووەو خۆیان بەبراو هاوکاری یەکتر داناوە، ئەم ئاشنایەتی و نزیک بوونەوەیە لەسەردەم و ژیانی (سەید عەبدولقادر)و سەرداری کورد (شێخ مەحموودی حەفیدزادەی بەرزنجی)دا زیاتر گەشەی کردووەو خۆی هاویشتووەتە قۆناخێکی لەبارترو پێکەوە پەیمانی تێکۆشان و برایەتییان بەستووەو بەنامەی وەفاو دڵسۆزی یەکتریان بەسەر کردووەتەوەو لەتاڵی و شیرینیدا لەیەکتر دانەبڕاون و تائێستاش کۆمەڵێ لەنامەکانی شێخی نەمر بۆ سەید عەبدولقادر لەلای ئەم بنەماڵەیە پارێزراون و شێخی نەمر لەنامەکانیدا بە (جەننەت دەرە) ناوی بردووە.

(٩)محەمەد رەسول هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی لەندەن، ١٩٩١، ل٥٠-٥١.

(١٠)ئەحمەد خواجا چیم دی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٦٩، ل٧٤.

(١١)سەرچاوەی نۆیەم، ل٥٧.

## بەشی سیانزەیەم

# خانی دزلّی‌و بەلّگەی ئەدەبی

دوای برانەوەی شەڕی مێژوویی(دەربەندی بازیان) وبریندار‌بوونو بە دیل گرتنی شێخی ئەمری بەردەقارەمانو گرتنەوەی شاری سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەکانەوە، دەربەدەربوونی شۆڕشگێڕانو دۆستو خزمو لایەنگرانی شێخی ئەمرو چۆلّکردنی شاری سلێمانی‌و ڕەوکردن بەرەو مەریوانو دزلّی‌و ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستان، بارودۆخێکی نالەبار باشووری کوردستانی گرتەوە، شاعیری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد (ئەحمەد بەگی ساحێبقەران_ حەمدی ١٨٧٨-١٩٣٦/١١/١٢) کە خۆی یەکێك بووە لە گەورە پیاوو ئاوارەکانی ئەو شۆڕشە، بەم بۆنەیەوە پارچە شیعرێکی زیندووی هۆنیوەتەوەو بەڕێزو کسپەو ئازاری دەروونەوە ناوی (شێخ مەحمودو مەحمود خانی دزلّی‌و مەحمود خانی کانی سانان) دەباتو دەوری بالاّیان دەردەخاتو زنجیرەی خەباتیان دەگێڕێتەوە. دواتر ئەم شیعرە ناوازە مێژووییە لە لایەن چەند شاعیرێکی بە سەلیقەوە دەکرێ بە پێنج خشتەکی کە لە هەموویان دیاری‌تر (شێخ سەلام ١٨٩٢_ ١٩٥٩/٣/٣) ی ئەمرە. جا بەو مەبەستەی کە ئەم بەلّگە

ئەدەبی‌یە زیندووە بە ڕوونی ڕووداوەکانو ئاوارەبوونی دانیشتوانی کورد باس دەکات، بەپێویستم زانی کە لەم بەشەدا پێنج خشتەکی‌یەکەی شێخ سەلام بلاو بکەمەوە کە لە سەر شیعرەکەی (حەمدی) دای‌ناوە.

«پێنج خشتەکی شێخ سەلام لە سەر شیعری حەمدی» [1]

دەربــەدەربووەو غــەریبم مــن بــە دەس ناپاکــەوە
وێــڵو ســەرگەردانو حــەیرانم بــە ســینەی چاکــەوە
چـاو بـە خوێـنو لێـو بـە ئـاهو سـەر بـە تـۆزو خاکـەوە
وەك هــەوا کەوتووەمــە گێــژی گونبــەدی ئەفلاکــەوە
ڕەبــی بی‌بینـم وەکـوو کیسـرا بـە سـینەی چاکـەوە
مـن بـە دەسـت گەردوونـەوە جـەرگم هـەناوم لـەت لەتـە
شــاهو ســولتانو وەزیــری لا گــەداو بی‌ســەتوەتە
بێوەفــاوو پرجــەفابێ ئیحتیــاجی حوجەتــــە
بۆ کەســێ تــا ســەر وەفــاداری نــەبوو بێمروەتــە
سەیری ئەسکەندەر ئەکەن ڕۆیـی بـە مشـتێ خاکـەوە
تــەوقی زەڕینــی بــە کــەردا ئەســپی نــەژدی مــردووە
تینوویــی ئــاوی حەیاتــە، ژەهــری مــاری چەشــتووە
پێــچو ناســازە تەبیعــەت قەڕنــەها هــەروابووە
چاکــە دایــم هــەر لــە پێنــاوی خراپــا ڕۆیــوە
گەوهـەری دەریـا بـە دایـم وا لـە ژێـر خاشـاکەوە[2]
چــەند لــە ژێــر خاکــا ڕزانــی لاشــەیی شــاهووەزیر
پیــاو بەســەر دارا ئــەکا، ناپیــاوە ســەردارو ئــەمیر
بــێ غوبــارە تیغــی داریــن، ژەنــگ ئەنێتــە شــیرو تــیر
هەر شکستی ئـەهلی مـەعنای مەتڵەبـە دەورانـی پـیر
ڕەش ئەخاتــە سەرســپی، پیســی ئەکاتــە پاکــەوە

ئـەهلی غـیرەت قـەت بـە قـەولی ئـەم سـەگە قـانع نـەبیٚ
تـەفرەو مـەکرو فڕوفێڵـی بـە گـویٚ سـامع نـەبیٚ
گـەر لـە دنیـادا بمێنـم فرسـەتیش واقـع نـەبیٚ
ئینتیقـامی خـۆم ئەسـێنم جـەهل ئەگـەر مـانع نـەبیٚ
شوعلـەیی ئـاهم ئەنێمـە خەرمـەنی ئیدراکـەوە
راحـەتی دنیـا سـەراپا تـا بـە ئـاخر میحنەتـە
سـەڵتەنەت ئـەمڕۆ ئەگـەر مـابیٚ لـە کونجـی عەزڵەتـە
تـاجی خوسـرەو، جـامی جەمشـیدی وکووسـواڵە لەتـە
خەرقـەیی شـاهو عەسـای مووسـا لـە لام بـیٚ شـەوکەتە
فەخـری ئێمـە وابـە کـەوڵو پۆسـتو دار مشـاکەوە
تـیٚ بگـەن ئێمـە ئەسـیرین موختەسـەر مـن وا ئـەڵێم
دەسـتت بەسـراوە مـەڵیٚ مـن نـاوی خـۆم مێجـەر ئـەنێم
فـایدەی چـی نـاوی حەپسـە بـا لـەزمڕ گـیریٚ نقێـم
عیبرەتـە ئـەربابی غـیرەت تیٚبگـەن مـن چـی ئـەڵێم
ئەهلی عیصمەت حەپسە سەربەستی بەلای بیٚباکەوە
ئـەی بـرا بێگانـە چاکـە سـا لـە خـزمودۆس هـەڵێن
تاقـە یـەك کەسـیان ئەشـیٚ بـۆ شـیری نـۆ مەنجـەڵ هـەوێن
بـۆ قرانـیٚ مەنفەعـەت (سـاحێبقەران) یٚ دائـەنێن
قەومـەکانی روپیـە خـۆرم دێنـە بـەرچاوم ئـەڵێن
کەر بە جۆ بمریٚ شەهیدە سەگ بە گۆشتی لاکەوە
گـەرچی عـەدلی ئێسـتە وایـە شـێر لـە رێـوی رەم ئـەکا
حاجی‌یـە ئەسـنافە ئیمـڕۆ ئیدیعـای جـەم جـەم ئـەکا
بـۆ نـەمانی ئـەهلی غـیرەت وا سیاسـەت زەم ئـەکا
تا ئەبێتـە موڵکـی ئـەربابی حەمی‌یـەت کـەم ئـەکا
ئاگـری تـاجر ئەنێتـە خەرمـەنی مەلاکـەوە

شـــێنو واوەیلایـــە ئیشــم خــواردنم هـــەر دەردو خـــەم
ئـــاهی گــەرمم هەڵئەکێشــم گــڕ لـــە دنیـــا بـــەر ئـــەدەم
خوێـن لـە چـاوم هەرئـەبێ بـێ قوڕبـە سـەردا هەرئەکـەم
شەرتـە تـاڕۆژی قیامـەت دەسـت لـە ئـەژنۆ بەرنـەدەم
سەر لـە قوڕ نێـم بـۆ سیادەت بـەم دڵـەی غەمناکـەوە
حەســرەتو داخو ئەســەف، ســەد ناڵــەوو ئــاهو فیغـــان
بـــۆ رەئیســـی شـــێخو ســـاداتو ئـــەمیری کوردەکـــان
بـۆ حــەفیدی حــەزرەتی کـاك ئەحمــەدی قوتبــی زەمــان
بۆ دلێری حەزرەتی مـەحموودی مـەدوورحی جیـهان
تاقە یـەك گوڵ بوو بە فەرقی پـیری ئەحمـەد کاکـەوە
بـــۆ دوو شــــێرزادانی مــــەعصوم موئنســـی دەردو ئەلـــەم[٧]
بـێ کـــەس و بێیـــارو یـــاوەر، وێڵـــی شـــارانی عەجـــەم
دوای ئەمانـــە مـــن بـــەدڵ زاری بـــەکوڵ دیســـان ئەکـــەم
بۆ دوو مـەحمودخان ئەمیری سەرحەدی رۆمو عەجەم[٩]
بوونـە ئەسـحابی قورەیـشو چوونـە سلکی چاکـەوە
فەســڵی گــوڵ ڕۆیــێ ئـــەبێ بـــۆ خـــۆی بزانـــێ عـــەندەلیب
مـــن لەبـــەحری بـیری تـــەئریخا (غـــەریق) مـــابووم عـــەجیب
هـــاتفی غـــەیبی نیـــدای فـــەرموو ئـــەلا غـــەمگین ئـــەدیب
ساڵــی تــەئریخی ئەپرســی (ال کـاك احمـد غریــب)
کەوتـــە عالـــەم دڵ حـــەزین و دیدەیـــی نمناکـــەوە

١٣٢٨کۆچی

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی سیانزەیەم:

١-بۆ شیعرەکەی حەمدی، بڕوانە دیوانی حەمدی-ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان، چاپخانەی نەسعەد، بەغداد، ١٩٥٧، ل٣٨،٣٩،٤٠.

بۆ پێنج خشتەکی‌یەکەی سەلام، بڕوانە: دیوانی سەلام، چاپخانەی تەمەدون، بەغداد، ١٩٥٨، ل١٥٤تا١٥٨

ئەوەی شایانی باسەئەم دوو دیوانە هەردووکیان لەژێر چاودێری نووسەرو ڕۆژنامە نووسی چالاک جەمال خەزنەداروبەدوو پێشەکی بەنرخی دکتۆر مارف خەزنەدار بڵاوکراونەتەوەو کاك (ڕووف مەعروف فتاح)ی خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژی سلێمانی ئەرکی چاپی گرتبووە ئەستۆ.

(٢)خاشان واتە لەو زیخ

(٣)(شێخ سەلامی شاعیر لەپەراوێزی ئەم شیعرەدا لە ل١٥٧ی دیوانە چاپکراوەکەیدا وتویەتی:

دوو شێرزادان مەبەست لەشێخ ڕەووف و شێخ باباعەلی کوڕانی شێخ مەحمودن، چونکە کەباوکیان بە بریندار گیراو لەدەربەندەوە نێررا بۆ بەغداو لەوێوە بۆ تانە ئەم دوو منالە لەگەڵ هەندێ کەس و کاریانا فیراریان کرد بۆ ئێران بەڕاستی زۆر ناڕەحەتی‌یان بینی.

(٤)دوو مەحمودخان: مەبەست لە (مەحمودخانی دزڵی)و(مەحمود خانی کانی سانان)ە کەلەسەرەتای بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودەوە هەردووکیان دۆست و هاوپەیمانی شێخی نەمر بوون و لەم ڕێگایەشدا تووشی ئازارو ناڕەحەتی بوون.

# بەشی چواردەیەم

## ئەو بابەتانەی دەربارەی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە نووسراون

### بەشی چواردەیەم

## ئەو بابەتانەی دەربارەی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە نووسراون

هەرچەندە چاپی یەکەمی کتێبی (مەحمود خانی دزلی- شۆڕشگێڕی نیو سەدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان) لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی‌و تەگەرەی ناچاری بەژمارەیەکی ئێجگار کەم بڵاوکرایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوێنەرەواران بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش پێشوازی‌یان لێکردو لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا کەمو زۆر دەربارەی کتێبەکە دواون، سەرەڕای ئەمەیش بەنامەی تایبەتی‌و بابەتی بەباڵابڕین نووسەرەکەی بەسەرکراوەتەوە، ئێمەیش بەو مەبەستەی کە لەتۆماری مێژوودا بی‌یان پارێزین بەپێویستمان زانی کە لە بەشێکی تایبەتی ئەم چاپە نوێ‌یەدا بڵاویان بکەینەوە، دیارە ئەم کارەیش لەسوود بەدەرنی‌یەو ئومێدەوارین کە ئەم چاپەیان زیاتر لەلایەن خوێندەوارانەوە بەسەر بکرێتەوە.

مەحمود خانی دزلی

شۆڕشگێڕی نیوسەدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ

ژ ١٣٩٩

دووشەممە ١٩٩٧/٣/٢١

لەم هەفتەیەدا تازەترین کتێبی مێژوویی بەناوی (مەحمود خانی دزلی- شۆڕشگێڕی نیو سەدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان) لە نووسینی مامۆستا (عومەر مەعروف بەرزنجی) کەوتە بەرچاوی خوێنەران. کتێبەکە بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەکو یانزە بەشی سەرەکی، نووسەر بۆ ئەم مەبەستە پشتی بەستووە بەگەڵ سەرچاوەی کوردی‌و عەرەبی‌و ئینگلیزی‌و فارسی‌و پرس‌و ڕاو سۆراخ‌و گفتوگۆ، هەروەها ئەم کتێبە بەکۆمەڵێ وێنەو نەخشەو بەڵگەی مێژوویی ڕۆشتە کراوەتەوە..

گەلاوێژی نوێ

GELAWĔJÎ NIWĔ

گۆڤاری گەلاوێژی نوێ

ژ١ س ١

مایسی ١٩٩٧

نوسەرانی میللەتانی دەوروبەرمان بە شێوەیەکی زانستی زۆریان لەسەر شۆڕشی کوردستان نوسیووە،نوسینی هەندێکی تریشیان لەراستی لای داوە. تەنانەت نوسەری وایش هەیە لەناو خۆمانا لەژێر سایەی بیری مۆدێرنا موحاکەمەی شۆڕشگێڕەکانمان دەکاو بەئاسانی خەتێکی چەوتیان بەسەرا دێنێت.

شۆڕشگێڕێکی وەکو مەحمود خانی دزلیش یەکێکە لەوانەی چەند جارێك کەوتۆتە بەر ڕەخنەی نابەجێ‌و دڵڕەقانەی چەند نوسەرێکی خۆمان. کەسی وا هەیە هەوڵی شۆڕشگێڕانەی مەحمود خان دەخاتە خانەی کەف‌و کوڵی عەشایەری‌یەوەو بەس؛ بەو مەبەستەی دووری بخاتەوە لەهەستی نەتەوەیی‌و شۆڕشگێڕانە.

دیارە ئەو نوسەرانەی وەها جەستەی شۆڕشەکانمان دەخوێننەوە؛ دەکەونە ژێر کاریگەریی سیحراوی هەندێك تیوری مۆدێرنانە لەچەند لایەنێکەوە نامۆن بە ڕەگی

سەرهەڵدانی شۆڕشەکانمان. ئەم جۆرە خوێندنەوانەش ستەمێکەو دەرهەق بە مێژووی میللەتەکەمان دەکرێت.

کتێبی (مەحمود خانی دزلی شۆڕشێکی نیو سەدەی رۆژهەڵاتی کوردستان) تازەترین بەرهەمی مامۆستا (عومەر مارف بەرزنجی)ە. هەوڵێکی تازەترە بۆ خوێندنەوەی جموجووڵە شۆڕشگێڕیەکانی مەحمود خانی دزلی. ئاشکرایە لێرەو لەوێ، لەم کتێبو ئەو گۆڤارا ناوی مەحمود خان هاتووە یا وتاری لەسەر نووسراوە، بەڵام بەم شێوەیە نا کەوا لەکتێبێکی رێکو پێکدا بەرچاومان دەکەوێت.

نووسەر لەم پەراوەدا تیشك دەخاتە سەر هەوڵی شۆڕشگێڕانەی مەحمود خان لەسنووری ناوچەکەی خۆیدا (هەورامان)و پاشان دێتەسەر ئەوەی کە رۆحی شۆڕشگێڕانەی تەنها لەو سنوورە تەسکەدا نەسڕاوەتەوە. بەڵکو پەلی بۆ ئامادەگییەکی تەواو و ئاشکرای لە شەڕەکانی سلێمانیو قەرەداغو دەربەندی بازیانا هەبووە، دۆستێکی شۆڕشگێڕی شێخ مەحمودی نەمر بووە، ئێمە دەبێت بزانین ئەگەر مەحمود خان عەشایەرێکی دوور لە رۆحی شۆڕشگێڕانە بوایە، ئەوا بەتەماحێکی چاك لەسنووری عەشایەریی خۆیدا دائەمرکایەوەو هیچ خۆی لەقەرەی شەڕی سلێمانیو لێدانی هێزی ئینگلیز نەئەدا، شایانی باسە نووسەر پشتی بە چەندەها سەرچاوەی فارسیو عەرەبیو کوردیو بەڵگەنامەو وێنەی مێژوویی بەستووە.

گۆڤاری ئێستا

ژ ٤

ساڵی ١٩٩٧

لەم رۆژانەدا کتێبێکی مێژوویی بەم ناونیشانەی سەرەوە لە نووسینی عومەر مەعروف بەرزنجی کەوتە بەردەستی خوێنەوارانی کورد، کتێبەکە لەمەوڵو تەقەللای خەباتو ژیانی جوامێرێکی وەك مەحمود خانی دزلی دەدوێتو لاپەڕەیەکی بەشەوقی رۆژگارێکی دیاری کراو تۆمار دەکات کە کتێبخانەی کوردی لەم لایەنەوە ئاتاجی لێکۆڵینەوەی بەبڕشتە.

ئەم کتێبە بەقەوارەیەکی مام ناوەندی ١٢٦ لاپەڕەییو بەپیتی کۆمپیوتەر لێدراوەو بەچاپ گەیەنراوە، لەپێشەکییەکو پانزە بەشی سەرەکی پێك هاتووە کە ئەمانەن.

ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی، بەرکوڵی لەژیانی خانی دزڵی، بزووتنەوەکانی خانی دزڵی لە رۆژهەڵاتی کوردستان، خانی دزڵیو سەردار رەشیدی ئەردەڵان، شێخ مەحمودی حەفید زادەو خانی دزڵیو جەنگی مێژوویی دەربەندی بازیان، دوای جەنگی دەربەندی بازیانو رۆژگارێکی جەنجاڵ، پەیوەندیو ئاکۆکی هەردوو خانی دزڵیو کانی سانان، خانی دزڵیو جافەرسانی هەورامان، دزڵیو مەریوانو ئاوارەکانی شۆڕشی شێخ مەحموود، خانی دزڵیو بەڵگەی ئەدەبی.

جگە لەم بەشە سەرەکییانەی کتێبەکەی نووسەر کۆمەڵی وێنەو نەخشەو بەڵگەی مێژوویی دانسقەو بڵاونەکراوەی بەخۆوە گرتووەو هێندەی تر کتێبەکەی پۆشتە کردووەتەوە، لەلایەکی ترەوە پێویستە ئەوەیش بوترێ کە نووسەر بۆ ئەم بەرهەمەی پەنای وەبەر کۆمەڵی رۆژنامەو چاپەمەنیو بەڵگەی دێرینو سەرچاوەی کوردیو عەرەبیو ئینگلیزیو فارسی بردووە.

کتێبەکەی مەحمودخانی دزڵیو چەند سەرنجێك

نووسینی: عەلی تاهیر بەرزنجی (رێناس)

رۆژنامەی ئاڵای ئازادی ژ ٢٣٤

رۆژی ١٩٩٧/٦/١٦

ژ ٢٣٥ رۆژی ١٩٩٧/٦/٢٣

نووسینەوەی رووداوە سیاسییەکان ئەرکێکی پیرۆزە دەکەوێتە سەرشانی هەموو رۆشنبیرانو مێژوونووسان. چونکە تۆمارێکە دەچێتە ناو مێژووی گەلەوە. نووسینەوەی هەر رووداوێکی مێژوویی لەکاتی خۆیدا واتایەکی بەهێز دەبەخشێ، چونکە کەسانێ هەن بەچاوی خۆیان رووداوەکانیان بینیوە یان بەشدارییان تێداکردووە. مێژووی سیاسی بەشێکە لەمێژووی گەلو تەواوکەریەتی: مێژووی گەلی کوردیش کەلێنێکی گەورەی تێدایە چونکە مێژووەکەی بەتەواوەتی نەنوسراوە. زۆر رووداوی مێژووییو کەسانی لێهاتوو هەبوو. مێژوو فەرامۆشی کردوون. هەندێ

جاریش خۆمان لێیان بەرپرسین. بەڵام ئەوە واتای ئەوە ناگەیەنێ کە خامەی مێژوو نووسەکانمان هیچی نەنووسی بێ. ساغ کردنەوەی رووداوە مێژووییەکان پێویستی بە کۆششو گەڕان بەدوای سەرچاوە دادەبێ. ئینجا بەراوردکردنی سەرچاوەکان بابەتێکی گرنگە بۆ ئەو کەسەی تۆژینەوە دەکات. مێژووش بەحەزی تاکە کەسێک نانووسرێت. کاتێک مێژووی عێراق بنووسرێتو بڵێن مەلیك فەیسەل نۆکەری سۆڤیەتی جاران بووە. رەنگە ئەمە بە نووسین بنووسرێت بەڵام سەرچاوەو بەڵگەکان ئەوە ناسەلمێنن. یان بڵێن شێخ مەحموودی نەمر شۆڕشەکەی ئیسلامی بووەو داوای دەوڵەتێکی ئیسلامی کردووە. بەڵام سەرچاوەو بەڵگەکان دژ بە بۆچوونی ئێمە دەبن.

زۆر لە رۆشنبیرانمان چالاکیەکی زۆریان هەیە لەبواری ساخکردنەوەی رووداوە مێژووییەکاندا. نموونەی وەك مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجیو دەیانی تر کە بەرهەمە تازەکانیان گەشبینمان دەکات بە ئایندەی گەلەکەمان جێگەی ستایشن.

بەم زوانە بەرهەمێکی نوێی مامۆستا عومەر بەرزنجی کەوتە بەریدەی خوێنەران بەناوی (مەحمود خانی دزلیو شۆڕشگێڕی نێو سەدەی رۆژهەلاتی کوردستان) من دەست خۆشی زۆر لە مامۆستا دەکەم کە مێژووی کەسانێکی ونبووی گەلەکەمان زیندوو دەکاتەوە. کتێبە کەی بوو بە سەرچاوەیەکی گرنگ. بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبەکەی مامۆستاش هەندێ زانیاری دەخەمە سەر باسەکە بە بەڵگەی دیارەوە.

بەرهەمە تازەکەی مامۆستا عومەر بەرزنجی تایبەتە بە مەحمود خانی دزلی. بەڵام لەناو کتێبە کەداو لەهەندێ شوێنی پەراوێزەکانیاندا ئامارە بە زۆر رووداوو کەسایەتی ناودار کراوە کە زیاتر مەبەستی منە، لەمێژووی ناوچەی سەنگاوو زۆرجار ئامارە بەدوو (شێخ عەبدولقادر) دەکرێت، زۆرجاریش تێکەڵی یەکتر دەکرێن. ئەمەش سەر لە خوێنەر تێك دەدات، دوو ناوی لەیەك چوو لەناوچەکەدا زۆر جاریش نووسەر تووشی هەڵە دەکات.

د. کەمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا (دور الشعب الکردی فی الثورة العشرین العراقیە ص١٤٣-١٤٥) دا دەڵێت: (دوو فاکتەری گەورە هەبوون رێژەی بەشداری کوردیان لە شۆڕشی ١٩٢٠دا کەم کردەوە یان بەواتایەکی تر بارودۆخەکەیان ئارام کردەوە. ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ ناوەڕاستو خوارووی عێراقدا ئەوەش ئەمانە بوون:

١-ئەو گورزە کوشندەی کە ئینگلیز پێش ساڵو نیوێك لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی ١٩٢٠ ئاراستەی گەلی کوردی کرد ئەویش دوای شەڕەکەی دەربەندی بازیانی ١٩١٩ بوو.

٢-رۆڵی کۆنەپەرستی کوردو هەندێك سەرۆك عەشیرەتەکان. کە لایەنگری ئینگلیز بوون نەیانهێشت بڵێسەی ڕاپەڕین ناوچەکەیان بگرێتەوە. نموونەش بۆ ئەمانە زۆرە. لەناوچەی کەرکوكو هەولێرو سلێمانی.. لێرەدا بەناو ئامارژەیان بۆ ناکەم، بەڵام خوێنەر خۆی دەتوانێ لە کتێبەکەی د. کەمال مەزهەردا بیانبینێ.

ئامارژە کردن بەو دو فاکتەرە سەرەتایەك بوو بۆ چوونە ناو باسەکەی من، زەمینەیەکی باش دەخولقێنێ بۆ تێگەیشتن لەناوەرۆکی باسەکە. حەزنەکەم سەرەتای باسەکە بەوە دەست پێبکەم کە مێژوونووس لە کتێبەکەیدا (دور الشعب آفي ثورة العشرين العراقية) دا لەلاپەڕە ١٤١و ١٤٢ دا دەڵی: (هەتا لە سلێمانیشدا شێوەی خەباتکردن وانەبووە کە دەڵێن بارودۆخەکە ئارام بووە لەهەندێ بەشەکانی دەوروبەری سلێمانیدا چەند ناڕەزاییەکی عەفەوی دژ بە ئینگلیز کراوە. وەك ئەوەی لەسەنگاودا ڕوویدا ئینگلیزی ناچارکرد کاپتن (LEES) لە سلێمانییەوە بنێرێ بۆ ئەوێ پاش ئەوەی کابتن کۆبوونەوەی لەگەڵ شێخ عەبدولقادر کرد بارودۆخەکەی ئارام کردەوە).

لێرەدا ئەم شێخ عەبدولقادرە شێخ عەبدولقادری گۆپتەپەیە کە بەگوللە ئەبڕ ناسراوە. ساڵی ١٩٣٣ ز کۆچی دوایی کردووە. لەهەمان کاتیشدا ئەوەی تریان شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ کەریمی کەسنەزانە ساڵی ١٩٢١ ز لە ئێران کۆچی دواییکردووە. سەرۆکی تەریقەتی قادری بووە لەناوچەکەدا. ئینگلیز زۆر دژی وەستاوە.

بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوەکەمان زیاتر پشت بەسەرچاوە ببەستێت باثاوڕێك لە ڕۆژنامەکەی (میجەرسۆن) (پێشکەوتن) بدەینەوە. چونکە زمانحاڵی حکومەتی ئینگلیز بووە. بزانین لەربارەی ئەوەی د. کەمال مەزهەر ئامارژەی بۆ کردووە. چی نووسیوە. لەژمارە ١٨ی ڕۆژنامەی پێشکەوتن ساڵی ١٩٢٠ هەر بەڕێنووسە کۆنەکەی خۆی دەینووسینەوە. هاتووە دەڵێت: (شێخ عەبدوقادر افندی گۆپتەپە لەم ڕۆژانەدا لە سنگاو دەبێ هنی کەسی بدبێ دەست دەکەن بەقسەی هیچو پوچو خریك بونی تێکدانی بیری خلق بۆامە کە هیچ شتێك خراپ ڕووندا نوك لە پاشتردا بدرێتە پاڵ شێخ عەبدولقادر افندی خۆی دەچێتە کرچنە لگل چن سوارێکدا بۆ اگاداری ابناء هەر او ڕۆژە خبر گیشتە چمچمال و سلیمانی شێخ عەبدولقادر هاتۆتە کرچنە.

له سلێمانیەوە کپیتان لیز صاحب بۆتێگەیشتن‌و پرسیار ام ئیشە لگل چن سوارەیەکی عسکر نێرا بو سنگاو وختی کە کاپتن چوە اوێو تیگەیشتو چاری بە شیخ عبدالقادر کوتو زانرا کە شێخ عبدالقادر بەبیر خراپ نەهاتووە بو خدمت نیشاندان هاتووە کپیتان لیز نووسی بو حاکم سلێمانی‌و لپاشدا خوشی هاتوە شار چاوی بە حاکم کوت عفوی بو شیخ عبدالقادر وەرگرت‌و گرایەوە سنگاو، ایش‌و کاری ناحیە سنگاو لەژێر تماشاکردنی شیخ عبدالقادر دەبێت).

ناوچەکە خەریك بووە بەرەو تەقینەوەیەکی گەورە بڕوات بەرووی ئینگلیزی داگیرکەردا. بەڵام باروودۆخەکە هێمن کراوەتەوە بۆ ئینگلیز، کرپچنەیش لەوکاتەدا مەڵبەندێکی ئایینی گەورە بووەو بەهۆی فاکتەری ئاینیەوە هەمیشە دژی ئینگلیز بوون. پاڵپشتی شێخ مەحموودی ئەمر بوون. بابزانین ئیدو بۆچوونی ئینگلیز بەرامبەر شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان کە سەرۆکی تەریقەتی قادری بووە. چی بووە؟

دیسانەوە پەنا دەبەینە بەر سەرچاوە بۆ ئەوەی باسەکەمانی پێ دەوڵەمەند بکەین.

ئەدمونز لەکتێبەکەیدا (کرد، ترك، عرب) لەلاپەڕە ٢١٨و ٢١٩دا دەڵێت: (کرپچنە مەڵبەندی شێخێکی گەورەی بەرزنجی ناسراربوو کە عبدالقادری دووەمە، شێخ عەبدولکریم باسی سەرگوزشتەی ژیانی بۆکردین، (لێرەدا مەبەستی شێخ عبدالکریمی قادرکەرەمە- نووسەر) کە پار لە هەورامان ڕوویداوە کاتێك کە چووە بۆ ئەوێ تەندروستی باش بووە دەمەو بەیانییەك هەموو کوڕەکانی کۆکردۆتەوەو وەسیەتی خوێندۆتەوە بۆیان دوایی کڵاوەکەی کردۆتە سەر یەکێکیان بۆ ئەوەی جێنشین بێت دوای ئەوە سەعاتێك نووستووە هەڵساوە دەستنوێژی گرتووە شایەتمانی هێناوەو نوێژی بەیانی لە مزگەوت کردووەو کۆچی دوایی کردووە تا ئێرە شێخ عبدالکریمی قادرکەرەم بۆ ئەدمۆنزی گێڕاوەتەوە ئینجا ئەدمۆنز دەڵێت (بەڵام ئەم هەموو پیرۆزیە کە موریدو قەومەکەی باسی لێوە دەکەن لەگەڵ ئەو ناوبانگەیدا ناگونجێت چونکە ئەم شێخە بەتەمەنە زۆر دەسیسەو ئاشوبی لەبن سەردا بوو) (ئەوەی لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەوەیە پێناسەی ئینگلیز بۆ ئەو کەسانەی ملیان نەداوە بۆ سیاسەتەکانی هەمیشە بەخاوەن ئاشوبو فیتنە ناوی بردوون، شێخ عبدالقادری شێخ کریم کەسنەزانیش یەکێك بووە لەوانە. کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ سیاسەتی ئینگلیز نەبووە لە ناوچەکەدا پشتگیری لە شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی

ئەمر كردووە لەدوایی‌دا بەسەرچاوە روونی دەکەینەوە)"با جارێکی تر نیگایەکی رۆژنامەی پێشکەوتن زمانحالی (مێجەرسۆن) بکەین تا بزانین دەربارەی ناوچەکە چ دەڵێت: لەژمارە (٢٠)ی پێشکەوتن ساڵی ١٩٢٠دا هاتووە عزت ئەفەندی مدیری سەنگاو ئەم پیاوە لەپاش خیانەت جاریێ لە بەغدا حەپس کرا چەند مانگێك لەمەوپێش بەرلا بووە لە دواییدا هاتووە سلێمانی خۆی خستە بەردەم حاکمی سیاسی کە مامورییەتێکی بداتێ برسی نەبێ لەگەڵ ئەمەشدا لەگەڵ حکومەت خیانەتی کردبوو هەر بۆ ئەمە زۆرلێکراو نەبی کرا بە مدیر زاب ئەوەندەی پێ نەچوو ئەهالی زاب لەدەستی کەوتنە داد کە بێ عسمەتو خراپی دامەزرانی بوو لکل ژنانی ئەوێ لەبەر ئەم ناپیاوەتیە نێررا بۆ سەنگاو وەختێك کە جەنابی شێخ عبدالقادر ئەفەندی مەبەستی شێخ عبدالقادری کۆپتەپەیە کە ناسراوە بە گوللە ئەبڕ (نووسەر) گەیشتە ئەوێ لەوێ لەپاش چاوپێکەوتنی کەپیتان لیز صاحب لەگەڵ شێخ عبدالقادر ئەفەندی عزت ئەفەندی هنێ قسەی بەجێ‌و فسادی لکل کردبوون بشکو ئیشەکەیان تێك بداو جەنابی شێخ عبدالقادر افندی چونکە گوێی نەدابووە ئەم قسە پڕوپووچانەو عزت لەکردەوەی خۆی نەتیجەیەکی نەدیبوو لە ترسا رای کردە ناو زەنگەنە بۆ چوونە کفری لگل بێ ئەدبانی ئەوێ یەك بگریت (مەبەستی شۆڕشگێڕەکانی برایمی خانی دەلۆیە (نووسەر) بەڵام هەر کە چووە خاکی زەنگەنە وە باش باش رووتیان کردو، دیسانەوە گرایەوە رای کرد ناو سنگاو بە رووت‌و قووتی مفلیس تواو شێخ عبدالقادر ئەفەندیش تەعقیبی کرد ئێستا شاریەدەر بووە وەك سوالکەر هیچ رەنگو نیشانەیەکی پێ نەماوە).

لێرەدا نامەوێت زۆر لەسەر ئەمە بدوێم تەنها ئەوەندە نەبێت دەڵێم زمانی ئەدمۆنز لەگەڵ دۆست‌و دوژمنانی خۆیدا شێوەیەکی تایبەتی هەیە دەتوانین لەوە زۆر شت تێبگەین. ئەدمۆنز لەکتێبی (کورد.. تورك.. عەرەب) لە لاپەڕە (٢٠٤،٢٠٥)دا دەڵێت: ئینگلیز پشتێنەیەکی ئەمنی بە دەوری شێخ مەحمووددا دروست کردبوو بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتەکەی کەم بکاتەوە قەزایەکی تازەی درووست کرد لەناحیەی قەرەداغ‌و سەنگاو یەکێك لە بنەماڵەی بەرزنجی بۆ دەست نیشان کرد، ئەویش شێخ عبدالقادرە کە بە عەولی سەنگاو ناسراوە هەروەها لە هەمان کتێبدا لەلاپەڕە ٣١٨دا ئەدمۆنز ئاماژە بە قایمقامی قەرەداغ دەکات کە شێخ عبدالقادری کۆپتەپەیە.

بابزانین شێخ عبدالقلدرەکەی تر کێیە؟ رۆڵی چی بووە؟ هاوکاری کردووە لەگەڵ ئینگلیز؟ یان دژی سیاسەتەکانی ئینگلیز بووە لەناوچەکەدا؟

ناوی شێخ عبدالقادره کوڕی شێخ کەریمی کەسنەزانە ماوەیەک لە گوندی کەسنەزانی قەرەداغ بووە دوایی هاتووەتە گوندی کرپچنە لە بناری شاخی سەگرمەیە سەرۆکی تەریقەتی قادری بووە لەناوچەکەدا پاڵپشتێکی گەورەی شێخ مەحموودی نەمر بووە بەهۆی رۆڵی ئاینیەکەیەوە هیچ کاتێک هاوکاری لەگەڵ ئینگلیز نەکردووە ئەدمۆنز بەشێوەیەکی خراپ باسی دەکات:

کاتێك لەشکری شێخ مەحموودی نەمر ساڵی ١٩١٩ لەبازیان شکستی هێنا ئینگلیز بەربووە وێزەی ئەوانەی هاوکاری شێخ مەحموودیان کردبوو لە سلێمانی کۆمەڵێك خێزان دەربەدەر بوون بەرەو ناوچە سنووریەکان رۆیشتن ئینگلیز لەشکری بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان رەوانە کرد بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لەو کەسانە بکاتەوە کە پاڵپشتی شێخی نەمر بوون. ئەدمۆنز لە کتێبی (کورد، تورك، عەرەب) لە لاپەرە ٥٢دا ئاماژە بۆ نامە دەکات کەوا رەتڵێك لە (١٦)ی حوزەیرانی (١٩١٩)دا توانی بەدرێژایی خانەقین و سیروان هەڵەبجە کۆنترۆڵ بکات. کاپتن لیزی بۆ بگێڕێتەوە هەروەها لە تەموزیشدا رەتڵێك توانی ناوچەکانی سورداش و شاربازێڕ و بەرزنجەو پێنجوێن و خورماڵ پاکسازی بکات، رەتڵێکی تریش توانی ناوچەکانی قەرەداغ و سەنگاو پاکسازی بکات لەوکەسانەی کە پاڵپشتی شێخ مەحموودی نەمر بوون توانیان گوند بەگوند بگەڕێن و دەست بەسەر چەند پارچە چەکێکدا بگرن و لێرەدا شێخ عبدالقادری شێخ کەریمی کەسنەزان بەر ئەو شاڵاوە کەوت ناچار کرپچنەی بەجێ هێشت بەرەو چیای سەگرمە رۆیشت ئەوردوی ئینگلیز گوندی کرپچنەیان سووتاند شێخ عەبدولقادر خۆی و جەماعەتەکەی بەرەو گوندی (خاوێ)ی ناوچەی قەرەداغ بەرێکەوتن، چەند شەوو رۆژ لەچیای سەگرمە خۆیان حەشاردا لەترسی لەشکری ئینگلیز، هەروەك چۆن لەسلێمانی خەڵکێکی زۆر بەرەو سنوورەکانی ئێران ئاوارە بوون، هەر بەو شێوەیەش شێخ عەبدوقادری شێخ کەریمی کە سنەزانیش خۆی و خزم و کەس و کاری و کۆمەڵێك لە موریدەکانی بەرەو کوردستانی ئێران رۆیشتن و لەگوندی (هەزار خانی) نێوان مەریوان و سنەدا نیشتەجێ بوون، شێخ هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەهێننەوە بۆ کرپچنە، (بۆ زیاتر سود وەرگرتن لەو بابەتە بڕوانە وتاری نووسەر عەلی تاهیر بەرزنجی لە پاشکۆی عێراقدا ژمارە (٨٦) لەژێر ناونیشانی (چەند لاپەرەیەك لەمێژووی گەلەکەمان).

دوای دامەزراندنی حکومەتە کاتیەکەی کوردستان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموودی نەمر ژمارەیەکی زۆربە مەزبەتە لەهەموو ناوچەکانی کوردستان کۆکرایەوەو پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی جیهان و کۆمەڵەی گەلان کرا بۆ پشتگیری کردنی حکومەتی شێخ مەحموودی نەمر.

شێخ مەحموود یەکەم نامەی بۆ کۆنگرەی ئاشتی جیهان نارد لە پاریس، گەلی کوردیش لە هەموو ناوچەکانی کوردستان پاڵپشتی شێخی نەمر بوون. ئەمەش لە بەرواری (١٩١٩/٢٠) دا بوو. یەکێك لەو کەسایەتیە ناودارانەی کە پاڵپشتی شێخ مەحموود بوو لەم داواکاریەدا شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزانە.

دوای وەفات کردنی شێخ عەبدولقادر، شێخ حوسێنی کوڕی (١٨٨٣-١٩٣٨) جێگەی گرتەوە لە بەڕێوەبردنی تەریقەتی قادری، ئەمیش لەسەر پاڵپشتی کردنی شێخ مەحموودی نەمر بەردەوام بوو، بەڵگەشمان بۆ ئەمە یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفیدە لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحموود کە لە لاپەڕە (٣٧)دا دەڵێت: بروسکەی ژمارە (٥٢٣) لە بەرواری (١٩٢٥/٣/٣٠)دا بۆ مەقامی بەرزی سەرەك وەزیران.

ئێران- تاران - وێنەی بۆ:

ا-باڵوێزخانەی ئەمەریکا.

ب-باڵوێزخانەی تورکیا.

ج-باڵوێزخانەی ئیتالیا.

د-باڵوێزخانەی روسیای سۆڤیەتی.

ه-باڵوێزخانەی دەوڵەتی فەرەنسا.

یەکێ لەوانەی ئەم بروسکەیان مۆرکرد، ئەم ناوەی خوارەوە بوو.

سەرۆکی تەریقەتی قادری هۆزنشینی تەکیەی کریچنە- سەنگاو، کەرکوك- شێخ عەبدولقادر زادە سەید حوسێن، هەروەها مامۆستای بەڕێز عومەر مەعروف بەرزنجی بۆ یەکەم جار دەستنوسێکی سەرۆکی تەریقەتی قادری، شێخ حوسێنی بڵاوکردەوە، لەکتێبەکەیدا کە ئاراستەی پارێزگاری ئەو سەردەمەی سلێمانی کراوە. داوادەکات مەحموود خانی دزڵی ئازاد بکەن، ئەم دەستنووسەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرواری (١٩٣١/٩/٢٠)ز.

شێخ لەتیف لە یاداشتەکانیدا لە لاپەڕە (١١١)دا دەڵێت: ئینگلیز لەسەربەخۆیی داندا ڕاستگۆنەبوو، بەڵکو دەیانویست شێخ مەحموود بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکانی خۆیان بەکاربهێنن، بەڵام مەرامەکەیان سەری نەگرت، شێخی تینوی ئازادیو سەر بە خۆیی بەقسەی ئەوانی نەکرد. ئەمە وای لە ئینگلیزەکان کرد پەنا بەرنە بەر پیاوانو نۆکەرانی خۆیانو ماڵێکی زۆریشیان بەسەردا بڕژێنن. ژمارەیەکی زۆر چوونە پاڵ ئینگلیز بۆ لێدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، پۆستی قایمقامو بەڕێوەبەری ناحیە یان وەرگرت، بە پێچەوانەوە شێخانی کرپچنەو کەنی کەوە تا سەر لەگەڵ شێخ مەحموودی نەمردا بوون، شێخانی کرپچنەش لێرەدا مەبەستی شێخ عەبدولقادرو شێخ حوسێنی کوڕێتی (نووسەر).

دیسانەوە شێخ لەتیف لەیاداشتەکانیدا لە لاپەڕە (١٧٧)دا دەڵێت: (کاتێك هاتینە پیران لەناوچەی کوردستانی ئێران، دێیەکی بچکۆلانە هەبوو چەند ماڵێکی جووتیاری هەژاری تێدابوو، لەخانووەکەی خزمە دڵسۆزەکەی شێخ مەحموود، شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان نیشتەجێ بوون، ئەویش دوای شەڕی دەربەندی بازیان بەرەو ئێران هاتبوو).

# ناساندنی کتێب

## مەحمود خانی دزلی... شۆڕشگێڕی نیوسەدە[1]

**عبدالقادر دەباغی**

( ناساندنی کتێب )

مەحمود خانی دزلی شۆڕشگێری نیوسەدە

[illegible]

.................[2] (مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی هەنگاوێکی بەکەڵکی هەڵگرتووەو ڕەوشتێکی نوێی هێناوەتە مەیدان، بەژیانەوەو بەسەرکردنەوەی یەکێ لەسەردارە قارەمانە نیشتمانپەرستەکانی کورد واتا (مەحموود خانی دزلی) خزمەتی بەمێژووی نەتەوە چارەڕەشەکەی کردووە.

لەو بڕوایەدام کەهەر کوردێکی دڵسۆز بەم ئاوو خاکە بیخوێنێتەوە فرمێسکی خۆزیاو حەسرەت دەڕژێنێ کەبەم گشت فیداکارییو لەخۆبوردوویی‌یەوەو بەم هەموو شەهیدە ئازیزەوە هێشتا عیبرەت ناگرینو ئاگری شەڕی براکوژیو خۆکوژی لەراستیدا کوردستان فرۆشیو نەتەوەکوژی بەفیتی دوژمنان نێڵە نەدەینو مێژووی خوێناوییو پڕ لەشانازی کورد بەلاپەڕەی ڕەشو پڕ شەرمەزاری نەڕەنگێنین.

---

[1] لەکاتێکدا چاپی یەکەمی ئەم کتێبە بڵاوبووەوە دانەیەکم پێشکەش بەبەڕێز عەبدولقادری دەباغی کرد، پاش ماوەیەك ئەم نووسینەی بۆ ناردم کەلەیەکێك لەگۆڤارە کوردی‌یەکاندا بڵاوی‌بکەمەوەو لەنامەیەکی تایبەتی‌دا ئەم ڕاسپاردەیەی نووسیوەو ناوی (پەیڤینو گەلاوێژی‌نوێ)ی بردووەو بەنیازبوو کەبیدەم بەیەکێك لەو گۆڤارانە، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێ بڵاوکردنەوەی بۆ ڕێنەکەوتو منیش لێرەدا بەشانازی‌یەوە بڵاوی‌دەکەمەوەو لام وایە باشترین شوێن بۆ ئەم وتارە چاپی دووەمی کتێبەکەیە کەدەتوانرێ بیروڕاو بۆچوونەکانی مامۆستای تیا بپارێزرێ.

[2] ئەو خاڵانەی بەبۆشایی بەجێ هێڵدراوە چەند وشەیەکن کەمامۆستا دەباغی ستایشی نووسەری کتێبەکەی کردووەو وام بەباش زانی ئەو چەند وشەیە لابەرمو داوای لێبووردن لەمامۆستا دەکەم.

ئەوەی لەو کتێبە بەنرخەدا منی جاڕز کردووە وشەی حەفیدو حەفیدزادەیە، کەبەداخەوە لەبڕێ شوێنی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێت.

بەر لەگشت باسێ بەپێویستی نەزانم سەرنجی مامۆستا عومەرو مێژوونووسانی بەڕێز بۆ ئەم ڕاستی‌یە ڕاکێشم کەیەکێ لەهۆیە بنەڕەتی‌یەکانی خۆشەویستی لەرادەبەدەری شێخ مەحموودی مەلیک ڕاگەیاندنی مەلیکی خۆی وەك پادشای کوردو هەڵکردنی ئاڵای ئیستقلال و سەربەخۆیی و دانانی هەیئەتی وەزیران و...تاد.. بوو نەك ئەوەو نەتیجەی کاك ئەحمەدی شێخ بەهەموو گەورەیی‌یەوە.

لێرەدا جێگەی باس و لێکۆڵینەوە لەکەم و کوڕی‌و ناتەواوی دەزگای حکوومەتی شێخ نی‌یەو بەتێڕوانینێ لەم ڕاستی‌یە کەکورد حکوومەتی ڕەسمی نەبووەو قانونی دانەناوە، دیسان جێگەی شانازی‌یە کەمەلیك مەحموودی کورد بەناتەواوترین چەکی سەردەم، گەردنی بەرزو سەرفرازی بۆ گەورەترین و پڕشکۆترین ئیمپراتۆری دنیا واتا بەریتانیای مەزن کەتیشکی خۆر هەمیشە لەئالاکەی دەدا، کەچ نەکردو لەبەرانبەریاندا ڕاوەستاوە تەنانەت بەگژیاندا چوو. ئەگەر ئیمپراتۆری بەریتانیاش لەفێڵە ئەزموونکراوەکەی لەمێژینە واتا لەجاشێتی کەڵکی وەرنەگرتباو چەند دەسەڵاتدارێکی کورد لەجیاتی گیانبازی لەژێر سێبەری ئاڵای پیرۆزی کوردستان نەبوونایەتە کەراسووری بەرتیپ، ئێستا وەزع جۆرێکی تردەبوو. جا ئیدی هیوادارم ئەم وشە ڕەق و تەقەی حەفیدو حەفیدزادە وەلا بنرێ‌و ناوی پیرۆزی شێخی ئەمر هەر بەمەلیك مەحموود بوترێت و بنووسرێت.

سەبارەت بەشەهید (مەحموود خانی دزڵی) کەپێویست بوو شەڕو هێرشەکانی شی بکرابا و لەروانگەی عەسکەریشەوە لەسەری بنووسرابا هەر ئەوە دەڵێم کەئەم سەردارە ڕەشیدو قارەمان و نیشتمانپەرست و مەلیك ویستە ئەوەندە بەوێژدان و پاك و ساکارو دڵاوابووە کەئینسان دەبێ لەناخی دڵەوە خۆشی بوێت.

برای بەڕێز سەید عەبدوڕەحمانی سنەیی دەنووسێت کە: مەحموود خانی کانی سانانی ئەدیب و زانا ڕۆژێك لەگەڵ مەحموودخانی دزڵی دەچنە گزندی (سەوڵئاوا)، چەند مەلا لەگەڵ خەڵکی دێ بەرەوپیریان دەچن و بەخێرهاتنیان دەکەن، مەحموود خانی کانی سانان لەمەلایەك دەپرسێ‌و ئێژێ: ئەم ئەرزی موکەڕەمەی موفەخەمەی سەرو ئابادە بۆچی لەم یوزرەع‌و لەم یوسمەر ماوەتەوە؟ خانی دزڵی بەوپەڕی ڕووخۆشی‌یەوە ڕوودەکاتە خانی کانی سانان و دەبێژێ: ئەم فڵتە فڵتە چیشەن، واچە چی ئەکێڵیان. هەر ئەم تاقە نوکتە خۆش و سادەیە ڕادەی پاکی‌و بێ فڕوفێڵی خانی دزڵی دەسەلمێنێ.

بەڵام سەبارەت بەمەحموودخانی کانی سانان بەڕێز کاك باباعەلی میهرپەروەر فەرمووی کەخانی کانی سانان پیاوێکی زاناو ئەدیب و ئەهلی کتێب و موتاڵەعەبووە، لەزەمانی ڕەزاشادا بەبەرتیل خۆی لەگرتن و دوورخستنەوە ڕزگارکردو تەنانەت پلەی

سەرهەنگی ئیفتخاریشی وەرگرت، بەڵام لەساڵی ١٣٢٤ بەفیتی ئینگلیز شەڕی لەگەڵ ئەرتەشدا دەست پێکردو بەفێڵ گیراو لەزیندانی قەسەری تاران کوژرا، خانی کانیسانان سەرۆکی تایفەی حەیدەربەگی بووە.

سەبارەت بەمەحموودخانی کانی سانان و کردەوەکانی هیوادارم کەپیرە پیاوانی مەریوانی و ئەوەکانی هیمەت بکەن لەدووتوێی کتێبدا بینووسن، ئەوەندەی کەخۆم ئاگاداریم ئەوەیە کەلەسەردەمی کۆمارە نازیزەکەی کوردستان ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە لام و لەکوتە کاغەزێکدا مامۆستا قانع نووسیبووی کەبەگورجی بچمە لای، پرسیم لەکوێیە؟ گوتی لەمیوانییە، بەپەلە چووم و بیرم لەوە دەکردەوە کەچۆن قانع نەهاتووەتەماڵەوە؟ کەبەخزمەتی گەیشتم روانیم دوو ئاغای پۆشتەو پەرداخ لەگەڵ مامۆستا قانع گەرمی قسە کردنن و چەند نۆکەرێ راوەستاون، سڵاوم لێکردن و مامۆستا قانع فەرمووی ئەوە (حەمەخانی مەحموودخانی کانی سانان)و ئەمەش (حەمەسدیق خانی سلێمانی خانی جاف)ەو منیشی بەوان ناساندو فەرمووی دەمانەوێ بەگورجی بەخزمەت پێشەوا بگەین، دەبێ ئەختێ بەپەلە بەعەرزی بگەیەنن. لەوەڵامدا عەرزم کردن کەدەچمە خزمەت ئاغای لەشکری رەئیسی دەفتەر بابزانێ چی دەفەرموێ، هاتمە خزمەت لەشکری و عەرزم کردو ئەویش چووە خزمەت پێشەواو فەرمووی بابێن، زۆریان پێخۆش بوو، چوونە خزمەتی و من چوومە سەرکاری خۆم. دوای چەند ڕۆژێ کاك سەید مستەفای سەییدی و پەلێ پێشمەرگە لەسەر شێوی سەقزەوە چوونە مەریوان و ئیدی ئەمزانی چکارێکیان بوو، هەروەها بۆ من جێگەی سەرسوڕمانە کەچۆن لەو سەردەمەدا خانی کانیسانان لەگەڵ دوو شاعیری ناوداری کورد واتا مامۆستا (قانع)و مامۆستا (ناری) کەخەڵکی ناوچەیەکن و زۆریش هاتوچۆیان پێکەوە بووە کەچی لەدیوانی هیچ کامیان غەزەل یا چامە یا پێنجخشتەکییە بەناوی (خانی کانیسانان)ەوە نەوتراوە؟

بەڕێز کاك سەید عەلی رەحمان دەنووسێ: لەساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی ١٩٤١ی زایینی کەلەمزگەوت دەمخوێند مامۆستاکانم ئەم شیعرەیان دەخوێندەوەو دەیانگوت هی (مەحموودخانی کانی سانان)ە کەوەختێ لەبەغدا گیراوە یا دەسبەسەر بووە ناردوویەتییەوە، بەڵام نابێ بینوسییەوە دەبێ لەبەری کەی، شیعرەکەش بەفارسییەوە ئەمانەیە:

خدایا واو رفتم، واو رفتم
زسینەی سوی بغداد رفتم
کنون در قلعهٔ بغداد هستم
همیشه بستەو ناشاد هستم
خدایا خگ خونم در نهانی
بەاقوام مریوان در سانی

جز این قصه دیگر ندانم
سلام رابه خسرو مهرسانم

شیعرەکان لەباری ئەدەبی‌یەوە گرنگ نین و ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام وشەی (خطخون) واتا دێڕی خوێناوی‌یە کەوابزانم ڕەمزەو دەبێ ئامارەیەک بێت نهێنی دەنا مەعنایەکی ئەوتۆی نی‌یە. سەبارەت بەشەڕی نێوخۆیی خانی دزڵی و خانی کانی سانان و جافرسان بەدڵنیایی‌یەوە دەڵێم کەئەو شەڕگەلە خوێناوی‌یانە بەفیتی حکومەتی ئێران هەڵگیرساوەو هەرگیز ئاژاوەچی‌یان و حاکمی کوردستان نەیان‌ویستووەو نایانەوێ کەنەتەوەی کورد بەگشتی و ئەو سێ سەرداره ڕەشیده بەتایبەتی پێکەوە تەبابن و بەیەکێتی و برایەتی بژین و ئەو سیاسەتە گڵاوە: دووبەرەکی سازکەو حکوومەت بکە، هەر ئێستاش بەردەوام و بەرچاوەو لەو سەردەمەدا کەڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەشێوەی دەرەبەگایەتی ئیدارە دەکرا، قەومانی ئەو شەڕو کێشانە لەزۆر جێگادا نائاسایی نەبوو، بێ ئاگایی کۆمەڵانی خەڵک و نەخوێندەواری و... ڕێگای ئاژاوەنانەوەی ئاسان کردبوو، بەڵام ئەمڕۆ هەر لەم کاولەنیشتمانەدا کارەساتی وا قەوماوەو دەقەومێ کەئینسانی تێگەیشتوو سەری سوڕدەمێنێ کەچۆن بەم گشت زاناو دکتۆرو ئەندازیارو پسپۆڕو گەریدەو فێرکارو.. بۆ دەبێ وەزعی باشووری کوردستان بەم شێوە فرمێسک هێنەربێت؟ ڕەزاشاو مستەفا کەمال لەچەند کوردێک دەترسان و بەبیستنی ناویان دەلەرزان بەتایبەتی ڕەزاشا لە (سمکۆ)ی شکاک و لەمەحموودخانی دزڵی زۆر ترسی لێ‌نیشتبوو، بەریتانیاو دەوڵەتانی ئەورووپایی کەدەیان‌ویست چەندین حکومەتی ناوەندی بەهێز بەچواردەوری یەکێتی سۆڤیەت هەر لەفەنلاندەو تاچین دامەزرێنن (کەداشیان مەزراند) هەموو جۆرە یارمەتی‌یەکی ئەو دیکتاتۆرە تازە پێگەیشتوانەیان دەدا.

ڕەزاشا بۆ فەوتانی ئەو دوو سەردارە قارەمانە سەرتیپ حەسەنی موقەدەم و سەرهەنگ مەحموودخانی ئەمینی هەڵبژارد، سەرتیپ موقەدەم بەزمانی لووس و فرۆفێڵ سمایل خانی سمکۆی ڕازی‌کرد کەوتووێژی لەگەڵدا بکات و داخوازەکانی تاراندەیەک بەجێ‌بێنێ، ئەوەبوو سمکۆیش کەپەنایەکی نەمابوو ڕازی‌کرا کەلەشاری شنۆ چاوی بەفەرماندەی هێز بکەوێ بەڵام سەرتیپ موقەدەم بۆسەی داناو لەمەوەڵ نەسرێژدا سمکۆ شەهید کرا..

بەڵام سەرهەنگ ئەمین بەگوێرەی پیلانێکی ژیرانە لەپێشدا خانی کانی سانانی دڵخۆشی داوەو سوڵتانی (سەروان)ی بەشانازی پێ بەخشی و بەسەرۆکی ژەندرمەی مەریوانی مەعاشی بۆ بڕی‌یەوەو لەخزمانی خانی دزڵیش چەند کەسێکی هەڵفریواندو ئینجا هێرشی کردە سەر دزڵی و لەڕاستیدا کوردەکان کەشارەزای ڕێگاوبان بوون شوێن هەڵەموت و دژوارەکانیان لەلەشکری ئێرانی گرت.

سەیر لەوەدایە گوزارشێ کەسەرتیپ موقەدەم دەیداتە تاران و ئەو فەتحانە کەلەبەردی مەرمەڕ هەڵکەندراوەو لەمزگەوتی دلر الاحسان بەدیوارەوە چەسپاندیان پڕ درۆبوو، ئەو فەتحانەیان بەهی ئەرتەش لەقەڵەم داو باسی فرۆفێڵی خۆیان نەکرد.

لەگەمەی رۆژگاری دوای دوورخستنەوەی رەزا شا لەئێران و هاتنە سەر تەختی حەمەرەزا شا، حەمەرەشیدخانی بانە شارەکانی سەردەشتی گرت و ئەرتەشی تێکشکاند، بۆ جاری دووەم کەدەوڵەت زانی حەمەرەشیدخان لەگەڵ مەحموودخانی دزڵی و مەحموود خانی کانی سانان و عەشایەری تیلەکۆو گەڵواخی رێک کەوتوون، سەرهەنگ مەحموودخانی ئەمین کەخانە نشینبوو هێنایانەوەو شا دەیکات بەسەرتیپ و داوای لێدەکات چۆن هەورامانی دزڵی گرتووە بەو شێوەیەش سەقزو بانەو سەردەشت رزگاربکات و گشت دەسەڵاتێکی دەداتێ. سەرتیپ ئەمین بەشێ لەتیلەکۆیی و گەڵواخی پەژیوان دەکاتەوەو دەبنە لایەنگری دەوڵەت، بەهێزێکی گەورەی نیزامی و عەشایەری بەرەو سەقز دەکەونە رێگاو لەئێوارەدا دەگاتە گوندی ساحێب و بێحەسانەوە روودەکاتە سەقزو شەڕ

دەستپێدەکات، سەرتیپ ئەمین لە رێگای قۆرخ و قەسابخانەوە دێتە پێش و هاوار دەکا من سەرتیپ ئەمینم تەسلیم بن عەفۆتان دەکەن؛ بەڵام عەبدوڵلاخانی برای سالار بەو تاریکەشەوە بەنیشانەی دەنگی یەوە دەسڕێژێکی لێ دەکاو دەکوژرێت و فاتحی دزڵی لەلای قەسابخانەی سەقز گیانی دەرچوو.

خانی کانی سانانیش بەفیتی ئینگلیزەکان کەدەیانویست لەناوچەی مەریوان و هەورامانیش شتێک دروست کەن کەلەوەختی خۆیدا بەرهەڵستی لەبیروباوەڕی کوردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و دەوڵەتی کوردستان بکات تێک پرژان، بەڵام بەداخەوە بەهەموو زانایی خۆیەوە پێوەدەبێ و فریو دەخوات و بەقسەی خۆش دەیبەنە تاران و لەوێ لەزیندانی قەسری قاجار دەیکوژن. ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەو رووداوگەلەو تێفکرین دەبینین کەدوژمنانی کورد هەمیشە بەهۆی کوردەوە شۆڕشە پیرۆزەکانی خنکاندووەو ئەزیلەی داڕوازی لەخۆی نەبێ ناقڵیشێ سەدان ساڵە ئەزموون کراوەو دەکرێتەوەو دەسەڵاتدارەکانیشمان بۆ چارەڕەشی ئەژدەها دەگرن بەقەد کێوێک و عیبرەت ناگرن.

لەکۆتاییدا هیوادارم قەڵەم بەدەستانی رووناکبیر بنووسینی بەسەرهات و ژیانی قارەمانە گومناوەکان و ناساندنیان بەنەوەی نوێو نەسلی تازەی کورد ئەرکی نیشتمانی و ویژدانی خۆیان بەجێبێنن.

عەبدولقادری دەباغی
١٩٩٧/٤/٢٧

# ئەنجام

دوای خوێندنــەوەو بەســەرکردنەوەی کرۆکــی ســەرجەم بەشــەکانی ئــەم لێکۆڵینــەوە مێژوویی یــە، دەتوانــین ئــەنجامو کورتــەی تێکــڕای کتێبەکـــە لەچوارچێوەی رستێك خاڵی چڕو پڕدا خەست بکەینەوە:

١-کـورد وەك نەتەوەیـەکی دێرینـی خۆرهـەڵات، لەبەرەبـەیانی مێــژووی سەرهەڵدانو چـوورەمەی ژیـانی کۆمەڵایـەتیو سیاسـیو ڕەوتـی ڕۆژگـارەوە هەسـتی بـەئازارێکی قـووڵو ئاسمـانێکی تـەماوی کـردووەو بەشــێوەیەکی بەردەوام جەستەی شـەکەتی لەڕووباری مەینـەتیو چەوسـانەوەدا هەڵکێشـاوە. دیارە ئەمەیش پەیوەستە بەژێردەستەیی نەتەوەکەو چوارمێخەکردنی خاکـە لـەتو پـەت کراوەکـەی، بەرانبـەر بـەم ژیانـە تـاڵو گـرژو پــڕ مەینەتیی یـەش رۆڵەکانی هەردەم لەگەڵ کاروانی خەباتو سەرفرازیدا هاوپەیمان بوونو چەند لاپەڕەیەکی مێژووی دێرینو هاوچەرخیان خەڵتانی خوێن کراوە.

٢-مەحمودخانی دزڵـی وەك گـەورە پیـاوو سـەرۆك عەشـیرەتێکی دڵسـۆزو دەسـت ڕۆیشـتووی کـورد پـەروەر ئـەوەندەی توانیبێتـیو سـاتەکانی ڕۆژگـار دەرفەتی بۆ رەخساندبێ لەئاست هەسـتی پیرۆزی نەتـەوەییو مافـە ڕەواکـانی کورددا کەمتـەر خـەمی نەکردووەو هەمیشە بەڕاستە ڕێبـازی خـەباتو بـواری کوردایەتیدا بەڕێ کەوتووەو لەباشوورو رۆژهەڵاتی کوردستانیشدا ماوەی نیو

سەدە كاراترین دەوری پرشكۆیی و نەبەردێتی گێڕاوەو لەم پێناوەیشدا ئازارو نەهامەتی و ئاوارەیی و زیندانەكانی بینیوەو بەجووتە لەگەڵ شێخی نەمری بەردەقارەماندا ڕەوانەی هیندستان كراوە.

خانیدزڵی بۆ مەبەستێكی ڕۆژانەو بەرژەوەندییەكی تایبەتی خۆی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا گرێ نەداوە. باشترین نموونەی زیندوویش ئەو نامە بەهادارە مێژوویییەی شێخی نەمرە كەساڵی ١٩٢٤ بۆ كەمالییەكانی توركیای ناردووەو لەو خەڵاتو دیارییە گرانبەهایانە دەدوێ كە خانیدزڵی وەری نەگرتووەو پشتی تێكردووە، لەلایەكی ترەوە ئەم سەردارە نەبەردە بەدرێژایی مێژووی ژیانی نەی ویستووە درز بخاتە ناو ڕێزەكانی بزوتنەوەی كوردایەتی و بەقسە ڕەنگاو ڕەنگو بەڵێنەكانی دوژمن فریو نەدراوەو هەموو هەوڵێكیان لەم بوارەدا شكستی هێناوەو بەڵگەنامەكانی ئەرشیفی بەریتانیا لەم بارەیەوە لێوان لێوو سەر ڕێژن.

٣-تێكڕا شۆڕش و هەوڵ و كۆششەكانی كورد لەسەرەتاوە بەو پەڕی شەوق و گوڕو هەستێكی بەكوڵەوە سەریان هەڵداوەو جێی خۆزگەو ئاواتی جەماوەر بوون، بەڵام دڕندەیی دوژمن و نەخشە گڵاوەكانی لەلایەكەوەو نەخوێندەواری و هەڵمەتە كاسەیی و گیرفان پڕكردنی جڵەو بەدەستان و پوازی ئابڕووبەرو سوود وەرنەگرتن لەپەندو وانەكانی ڕابوردوو، ئەمە جگە لەخۆخۆری یەكە! كەهەردەم وەك -جینات_ ئەم ئازارە لەنەوەیەكەوە ئەداتە دەست نەوەیەكی ترو نزمی ئاستی بیری كراوەی كوردو نەبوونی عەقڵێكی سیاسی گونجاوو پڕاو پڕی قۆناغەكە، هەموو جارێك ڕایەڵی بزوتنەوەكانی پچڕاندووەو بەشێوەیەكی مەرگەسات كۆتاییان پێ هێنراوەو سەركردەو داینەمۆی شۆڕشەكان بەرەو سێدارەو ئاوارەیی و زیندانی تاریك بەڕێ خراون.

٤-ئەوەی مایەی رامان و لێکدانەوەی قووڵەو لاپەڕەکانی مێژوو شایەتی بۆ دەدەن بریتی یە لەو دیاردەیەی کەبەدرێژایی مێژووی کوردو ڕاپەڕینەکانی، چاوساغ و ڕێ نیشاندەرو سەرکردەی بزووتنەوەکان زیاتر سەرۆک هۆزو گەورە پیاوانی خێڵ و پیاوانی ئایینی و کەسانی بەدەسەڵاتی عەشایەری بوون و تەنیا ئەوان توانیویانە جەماوەریان لەدەور خڕ ببێتەوە، ئەمەش بەرەو ڕووی ئەو ڕاستیەمان دەکاتەوە کەڕوناکبیرانی کورد بەدرێژایی مێژووی تەماوی ئەم نەتەوەیە لەبارێکی شکستی و پرزە بڕاوی‌دا بوون، ڕاستە لە قۆناغە جیاکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی‌دا روناکبیران ڕێکخراوو کۆمەڵەی سیاسی‌یان پێکهێناوە بەڵام ئەوانیش لەئەنجامدا بۆ خزمەت و پشتگیری ئەو بزوتنەوانە بوون کەسەرۆک هۆزەکان رابەری‌یان کردووەو هەر ئەوانیش جڵەو بەدەست بوون.

٥-لاپەڕە تۆمار کراوەکانی کورد بەگشتی و بابەتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەتایبەتی سەرڕێژن لەدڵپاکی و خۆش باوەڕی و فریودان و لێکدانەوەی کورت و ناتەواوی رابەرانی بزوتنەوە یەك لەدوای یەکەکانی کورد، کەبەتەنیا وشەیەکی شیرین و گفتێکی درۆو چاوو ڕاوێکی دوژمنان بەئاسانی کەوتوونەتە داوی تەنراوی ناحەزانەوەو لێرەیشدا پێویست بەناوو بەڵگە ناکات و ڕووداوەکانی ئەم کتێبە خۆیان دێنە قسەو هەموو ڕازێك دەدرکێنن.

٦-گزی کردن و ناپاکی و بوونە داردەست دیاردەیەکی دانەبڕاوی سەرتاپا مێـــژووی نەتەوەیـــە بەهـــەموو قۆناغـــەکانی ڕێکخـــراوو کۆمەڵـــە سیاســی وبزوتنەوەکانی کـوردەوە لکـاون، رەنگـە ئـەم مەسـەلەیە بـەئاتاجی لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوان و هەمەلایەنە بێ، لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بەگرنی دەروونی مرۆڤی کورد، کام بزووتنەوەو ڕێکخراوی سیاسی کورد بەدەستی ناموبارەکی کورد زیندە بەچاڵ نەکراوە؟! کام بزووتنەوەی کورد خۆش کردنی نێڵەی ئاگری لەناوبردن و دروست کردنی ناکۆکی و شپرزەیی دەستی خۆی

تێدا نەبووە؟! بەم پێیە دەتوانین بڵێین کەمەسەلەی کوردو ڕێڕەوی ژیانی وەك مەسەلەیەکی سیاسیو پەیوەست بەتەوەیەکی دیلو پەژمردە لەبازنەیەکی داخراودا بێ ئەنجامو نەخشەیەکی تەماویو تەڵخدا گیری خواردووەو لەباریدانییە کەدوا ڕۆژی ڕۆشنی خۆی بەدی بکات.

٧-نابێ پلانو ڕەگەز پەرستیوبەکرێگیراوی فەرمانڕەواو بەداخێکی سەختیشەوە (تەنانەت نەتەوەکانی دەوروبەر) مان پشت گوێ بخەین کەنامەردانەو هەمیشە تەونیان بەدارەوە بووە بۆ لەناو بردنو سەرکوت کردنی جووڵانەوە نەتەوەیییەکان.

دیارە پیا چوونەوەی یەك لەدوای یەکی ئەو جوڵانەوانەو هۆی شکستو لەناو چوونیان گەواهی ئەم قسانەن.

ئەوەی شیاوی وتنە ئەم تاقیکردنەوەیەی ئێستاش هەر درێژەپێدانی خەمەکانی ڕابوردووە، بەڵام لەدارو بارێکی نوێدا، واتە دەرسەکانی مێژوو نەك پشت گوێ خراون بەتەنیا، بەڵکو لای هەندێکیان هەر نامۆشەو دیارە لەو ڕاستییە بێ ئاگان کەداوەرییەکانی مێژوو هەمیشە ئەم جۆرە کەسو بیرکردنەوانە بەقێزەونییەوە تۆمار دەکات.

هوشیَن
بو پیشکوتن
۱۰ بوسری
-
یکی به آنه یکه

پیشکوتن

حفتة جاریك دردەچیت

کریو
بو شوشو یك
به ۳ مانگ یك
به شش مانگ د،
به سالیك چوار روپیه دەدا
اعلان یا ایشیکی خوی
له پرة دوایدا دەنوسریت
بو دودیرو ۳ آنه دەسیتریت

سال ۲ ‌‌ ژماره ۱۰۰ ‌ [ پنجشنبه ] ‌ ۲٤ رجب ۱۳٤۰ ‌ ۲۳ مارچ ۱۹۲۲

**وێنەیەکی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی سەردەمی مێجەر-سون- کەچەن جارێک سەبارەت بۆردومان کردنی ئاوایی‌یەکانی سەر بەمەحمود خانی دزلی هەواڵی بلاوکردووەتەوە**

## جناب محمود خان دزلی

له رؤساى عشـيرتان دوراى جناب محمود خان دزلى له كل آموزايان خوى على محمد خان و محمد رشـيد بك كوران جان‌الله بك و عبدالله بك سرتيپ . محمد على بك حبيب‌الله بك . محمد على بك سرباز بك لەكل قريب به صد سوار معيتيان بو شرفيابى زيارت حضرت حكمدار كردستان وارد سليمانى و له خانوى عبدالرحمن نيظاميى كه بو يان احضار كرابو مسافر بون بخير بين .

ژ ١١ی رۆژی ٢٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ی رۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی رۆژگاری حوکمدارێتی شێخ مەحمودی حەفید زادەی بەرزنجی کەلەم ژمارەیەدا لەمەحموود خانی دزلی دەدوێ

To:
Babakr Agha.

My Respected Brother, Somai. Dated 26.6.25.

I have on more than one occasion expressed my appreciation of your policy which has, for the last few years, been aiming at the welfare and interest of our race. The ruthless and barbarous treatment of the Turks to our people especially for the past several months, has confirmed the type of people you believed them to be. I am sure that hereafter you will stick more closely to your aims and exert more effort for the freedom of our nation. The Turk's relations with us have for ever been severed, not only because of their decision to exterminate our race but also because of their total denial of all religious beliefs and abolition of the Caliphate. I have therefore written and given the necessary advice to some of our misguided friends who are enslaved in the Turks and are still serving the bitterest enemy of our faith and nationality. Reshid Jaudat Effendi will hand them over to you, and you are requested to forward them to the addresses accompanied by your remarks, which should draw their attention to the facts explained therein. You are to try from now on to draw them nearer to the realisation of the good underlying your policy; and you and they with one accord should help to form a great alliance which will enable us to avenge our martyred brethren and those who are exposed to martyrdom. I fully agree with your policy which is the right path to our complete freedom. Any details regarding the Turkish atrocities against the Kurds will be given you by Reshid Jaudat Effendi. With best respect and heartiest wishes for your success.

(Sgd) Simko.

نامەیەکی مێژوویی سمایل خانی سمکۆ بۆ بابەکر ئاغای پشدەری لە ڕۆژی
٢٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ سەبارەت بەڕەفتاری دڕندانەی کەمالی‌یەکان

Translation of copy of a letter reported to have been sent

by Shaikh Mahmud to the Turks.

---

To:-

The Officer Commanding 8th Division and
Frontier Commissioner.

(I) Although it was mentioned in a letter dated October 1st, 1343, No:2348, which was received through Fattah Beg, the Mosul Deputy, that arrangements had been made to ensure the facilitation and assistance of the Persians, it has happened that since my interview with the representative of the British Government at Khurmal that the frontier officials are plainly opposing us and showing us difficulties, although it would be useful if they apparently showed themselves to be on bad terms with us, but by their preventing our transport, communications etc it shows their actual enmity. Although the matter has been gently explained to Abdullah

نامەیەکی مێژوویی شێخ مەحمودی حەفیدزادە کەلەساڵی ١٩٢٤دا بۆ کەمالی‌یەکانی تورکیای ناردووە،

لەخاڵی نۆیەمی‌نامەکەدا سەبارەت بەجوامێریی مەحمود خانی دزڵی دەدوێت

Khan Tahmasaibi, the Minister of War, who recently visited this part, and he was asked to improve these affairs, but the ignorant frontier officials have not improved their methods. It is essential to have this neighbour's support to assist, especially as the communication line is in this part. It is very necessary to explain the matter as quickly as possible through the foreign official. All the false intriguing aspirations of the British Government and their poisonous ideas have already been explained. I have been devoting all my prosperities, high degrees, such as my Kingdom, for the sake of the Muslim world, and I have not allowed myself to be an instrument for the intriguing ideas of the British Government, and I never shall be an instrument of theirs. The Kurdish affairs are in the same degree of calamity for both Governments, and as this is the point at which the cruel British Government is aiming, the aims of both Governments should be to unite in the one object. I therefore do not see any difference between the interests of our great Republic and the Persians and therefore I endeavour more for the sake of the Persian Government, as here is more likely for that aim. Further I would request the improvements of those questions that are out of the programme.

(2) The naturalisation forms that were sent were delivere to the persons concerned, but those for my son Latif, Hash Chaoush Majid Ghafur, the Barber and Sauit Dawlah have not arrived and I request they may be sent soon.

(3) I have the honour to acknowledge receipt of the medals sent for me and my sons, but it is necessary to keep this matter secret in these days, and we are keeping them for the suitable day which should not cause misunderstanding

(4) The question of the connection of the officers and men was explained. These are, as mentioned before, partly actual military officers and partly reserve officers. The title of "Militia" is out of the Army ~~Department~~ Establishment, and they beg to receive numbers of your Division so that they could be allowed, whenever necessary, to join the Army and serve the Republic as ordinary officers, and receive arrears of their pay. It is needless to say more about the good services of these officers, and they should never be made disappointed.

life so that I should pass my life in a happy spot of a Muslim country prosperously. I assure that I have never been deceived by the cruel deceitful intrigues of the British Government, and shall never be deceived, neither shall I ever become an instrument of them.

(7) Although Adil Effendi and Saiyid Ahmad Effendi are of impoisoned ideas but Adil is still a deserter and orders have been issued for his arrest alive or dead. As regards Saiyid Ahmad, it is necessary to get on well with him till the affairs are settled with the British Government, he will receive his deserving punishment when that is finished. There is nobody to be suspected in our assembly.

(8) It is not sufficient to give certificates to tribal leaders to keep them in good connection, there should be at least 300 various medals kept with me until the time comes, just to keep them in strong connection, also any orders I issue for secret funds should be of full credit, and I should receive the necessary authority for that purpose, these things, if approved, could be sent to us via Kirkuk.

(9) I gave the ammunition to our loyal, splendid, valuable friend Mahmud Khan of Dizli, and although he several times refused to accept the medal I made him accept after Orkhan beg left. He is such a friend and deserving of every kindness.

(IO) I have made several applications, secret and open, to prevent the blind Babekr from interference with our affairs, but he appears to have realised the truth and he forming obstacles in our matters and is intriguing to prevent our success. I can say that it is only the Pizhder among the tribes who prevent the Republic's aspirations in this country. They try for Kurdish independence, because they think that if I am defeated and progress is made there will be a ruler appointed among them. It is therefore the first duty to destroy such enemies.

Mustafa Sanrud is under English programme, having several demonstrations with a big Kurdish Committee. He is writing articles as if the Kurdish National question has been settled recently in Berlin and by the League of Nations. For example he has written a verse "I am a Kurd and say that in Kurdish it has come to an end, no more living in a low position, the Kurdish bud is opened." This confirms what I have said above.

(11) I am receiving many congratulatory letters from notables of Sulaimani and many gifts from merchants there. The frien[illegible] who are distant are very disappointed but it is necessary now for them to remain so.

(12) It is not possible to speak more or less with anybody till the affairs come to an hopeful end. I assure you that I am more anxious to capture and imprison the Englishmen than I was when capturing them at Derbend event and I am anxious to have a life of Turkish spirit in Sulaimani and bind the country to the Republic and prepare necessary grounds fo[illegible] the future.

) It is essential, as mentioned before, to leave temporary the goods and ammunition with Hajji Rasul Agha, it will be of no use to have it in and not possible as the money asked for has not arrived yet and the disappointment is increasin

I repeat my loyal sentiments and present my respects.

Sd. MAHMUD,

Commander in Chief,
of
Southern National movements.

October 9th 1343.

دانیشتوو : مەحموود خانی دزڵی

بەپێوە لەڕاستەوە : حەمە گردە ، خەڵکی سەرچاوەی زەڵم ،

حەمە سەعید نەسروڵڵا کۆماسی ، حەمە زەمانی کۆماسی

دانیشتوو : مەحموود خانی دزڵی

بەپێوە لەڕاستەوە : حەمە عەلی بەگی تفلی / حەمە سەعید نەسروڵڵا کۆماسی

نەجیبەی کچی مەحموودخانی دزڵی بەباوەشەوەیە

وێنەیەکی دانسقەی

شێخ مەحموودو سەردار ڕەشیدی ئەردەڵان

شێخ مەحموود بە بەرگی پاشایی‌یەوە

لەگەڵ سەردار رەشیدی ئەردەڵان

شێخ حسێنی شێخ عەبدولقادری شێخ کەریمی کەسنەزان

١٩٣٨-١٨٨٣

لەراستەوە: خوالێخۆشبوو حەمەی ئەورەحمان ئاغا، شێخ عەبدولقادری گوللە نەبڕ،
مەلا کاکە حەمە

ئەنوەر بەگی مەحموود خانی دزڵی

١٩٢٩ – ١٩٩٨

نووسەرو رۆژنامەنووسی رابەر

حسێن ناظم

١٩٣٢-١٨٦٤

مامۆستا - زێوەر ــی شاعیر

١٩٤٨ - ١٨٧٥

ئەحمەد بەگی ساحیبقران

« حەمدی »

١٩٣٦ - ١٨٧٨

**ویلسن**

**وەکیلی حاکمی سیاسی عێراق**

ژەنەڕاڵ فرەیزەر

فەرماندەی هێزی باشووری کوردستان

# سەرچاوەکان

## یەکەم: سەرچاوە کوردییەکان:


١-ئەحمەد خواجا، چیم دی، چاپخانەی شەفیق، بەغداد، ١٩٦٨، بەرگی یەکەم.

ئەحمەد خواجا، چیم دی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٩، بەرگی دووەم.

ئەحمەد خواجا، چیم دی، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی، ١٩٧٢، بەرگی سێیەم.

٢-ئەحمەد تەقی، خەباتی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا، رێکخستنو ئامادەکردنی بۆ چاپ، جەلال تەقی، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بەغداد، ١٩٧٠.

٣-جەمال نەبەز (دکتۆر)، کوردستانو شۆرشەکەی، کوردو لە ئەڵمانییەوە کردویەتی بەکوردی، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥.

٤- حەمدی، دیوانی ئەحمەد بەگی ساحێبقران، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٥٧.

٥-رەفیق حیلمی، یادداشت، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٦، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم.

٦-رەفیق حیلمی، یادداشت، چاپخانەی دار الحریە للطباعة والنشر، بەغداد، ١٩٩٢، بەرگی سێیەم.

٧-زێوەر، گەنجینەی مەردانو یادداشتی رۆژانی ئەربەدەری، محەمەدی مەلا کەریم رێکی خستووەو ئامادەی کردووەو پێشەکیو پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥.

٨-سەلام، دیوانی شێخ سەلام، چاپخانەی تەمەدون، بەغداد، ١٩٥٨.

٩-عەلائەدین سەجادی، شۆرشەکانی کوردو کوردو کۆماری عێراق، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، ١٩٥٩.

١٠-عەبدولرەقیب یوسف، بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٨٥.

١١-عەبدولقادری کوری رۆستەمی بابان، رەوشی کوردان، مێژووی کوردستان، وەرگێرانی کەریمی حسامی، ناوەندی چاپو راژاندنەوەی مەنسور، هاوینی ١٩٩١.

١٢-کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی کورد، چاپخانەی الادیب، بەغداد، ١٩٨٥.

١٣-کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، مێژوو، چاپخانەی (دار افاق عربیە)، بەغداد، ١٩٨٣.

١٤-كەمال مەزهەر ئەحمەد (دكتۆر)، تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لەڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
١٥-محەمەد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، چاپی لەندەن، بەرگی یەکەم ١٩٩٠، بەرگی دوەم ١٩٩١.
١٦-نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق.. سەردەمی قەڵەمو موراجەعات، سلێمانی، ١٩٩٩.

## دووەم: ڕۆژنامەو گۆڤارەکان:

١-بانگی کوردستان، (ڕۆژنامە)، ژ٦،س١، دووشەممە، ١٨ی ئەیلولی١٩٢٢.
٢-بانگی کوردستان، (ڕۆژنامە)، ژ٧، س١، هەینی،٢٢ی ئەیلولی ١٩٢٢.
٣-بانگی کوردستان، (ڕۆژنامە)، ژ٨، س١، هەینی،٢٩ی ئەیلولی ١٩٢٢.
٤-بانگی کوردستان، (ڕۆژنامە)، ژ١٠، س١، یەك شەممە، ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢.
٥-بانگی کوردستان، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١١ س١، ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢.
٦-پێشکەوتن، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ٢٤، ٧ی نۆکتۆبەری ١٩٢٠.
٧-پێشکەوتن، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ٦٩، ١٩٢١/٨/١٨.
٨-پێشکەوتن، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١١٣، ١٩٢٢/٦/٢٢.
٩-پێشکەوتن، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ١١٧، ١٩٢٢/٧/٢٠.
١٠-دەنگی گێتی تازە، (گۆڤار)، بەغداد، ژ٢ بەرگی ٤، مایسی ١٩٤٥.
١١-دەفتەری کوردەواری، (گۆڤار)، سلێمانی، بەرگی یەکەم، ١٩٧٠.
١٢-ڕۆژی کورد، (گۆڤار)، ژ١،س١٩١٢.
١٣-ڕۆژی کوردستان، (ڕۆژنامە)، ژ١١، س١، ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢.
١٤-ڕۆژی کوردستان، (گۆڤار)، بەغداد، ژ٤ س٢، حوزەیرانی ١٩٧٢.
١٥-ڕۆشنبیری نوێ، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١١٣، مارتی ١٩٨٧.
١٦-ڕۆشنبیری نوێ، (گۆڤار) بەغداد، ژ١٢٣، ئەیلولی ١٩٨٩.
١٧-ڕۆشنبیری نوێ، (گۆڤار)، بەغداد، ژ ١٢٤، کانونی یەکەمی ١٩٨٩.
١٨-ڕۆشنبیری نوێ، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١٢٥، بەهاری ١٩٩٠.
١٩-ڕۆشنبیری نوێ، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١٣٥، ئازاری ١٩٩٥.

٢٠-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ٥٣، سالی ١٩٩٣
٢١-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ٥٧، سالی ١٩٩٣.
٢٢-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١٠٢، ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧.
٢٣-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١٠٥، سالی ١٩٩٧.
٢٤-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١٠٧، ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٩٧.
٢٥-رەنگین، (گۆڤار)، بەغداد، ژ١١٨، ١٤ی تشرینی‌دووەمی ١٩٩٨.
٢٦-رامان، (گۆڤار)، هەولێر، ژ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩.
٢٧-رابون، (گۆڤار)، ژ١٧-١٨، س١٩٩٦، سوید.
٢٨-ژیان، (رۆژنامە)، سلێمانی، ژ٢٤، رۆژی ١٩٢٦/٧/١٥.
٢٩-ژیان، (رۆژنامە)، سلێمانی، ژ٢٥٩، رۆژی ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠.
٣٠-سەنتەری برایەتی، (گۆڤار)، هەولێر، ژ٥، نیسانی ١٩٩٨.
٣١-ڤەژین، (گۆڤار)، دهۆك، ژ١٠، زستانی ١٩٩٨.
٣٢-کاروان، (گۆڤار)، هەولێر، ژ١٧، شوباتی ١٩٨٧.
٣٣-کوهستان، (رۆژنامە)، تاران، ژ٤٣، رۆژی ١ی کانونی دووەمی ١٩٤٥.
٣٤-کوردستانی نوێ، (رۆژنامە)، هەولێر، ژ ٥٩٢، رۆژی ١٩٩٤/١/٢٠.
٣٥-مامۆستای کورد، (گۆڤار)، سوید، ژ١٧-١٨، بەهارو هاوینی ١٩٩٣.
٣٦-مەتین، (مجلە)، دهۆك، عدد٨١، سنە ١٩٩٨.
٣٧-هاوکاری، (رۆژنامە)، بەغداد، ژ١١٨٠، رۆژی ١٩٩٠/٥/٢٤.
٣٨-هاوکاری، (رۆژنامە)، بەغداد، ژ١١٨٥، رۆژی ١٩٩٠/٦/١١.
٣٩-التآخي، (جريدة)، بغداد، العدد ١٤٥٤، ١٩٧٣/١/٨.
٤٠-الاتحاد، (جريدة السليمانيه) العدد ٣٣٥، ١٩٩٩/٩/١٠.

### سێیەم: سەرچاوە عەرەبیەکان:

١-ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١.
٢-البرت نتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨.

٣-العشائر الكردية، ترجمة وتعليق الدكتور فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩.
٤-العراق في الوثائق البريطانية، ١٩٠٥-١٩٣٠، ترجمة وتحرير فؤاد قزانجي، دار المامون، بغداد، ١٩٨٩.
٥-دبليوارهي، سنتان في كردستان، ١٩١٨-١٩٢٠، ترجمة فؤاد جميل، بغداد، ١٩٧٢، الطبعة الاولى، الجزء الاول.
٦-سندرسن پاشا (مذكرات)، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٨٢، الطبعة الثانية.
٧-عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، الطبعة الثانية، الجزء الثاني، صيدا، لبنان، ١٩٥٧.
٨-فاضل حسين، (الدكتور)، مشكلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية العراقية الانكليزيه التركية، الطبعةالاولى، بغداد، ١٩٥٧.
٩-كمال مظهر احمد،(الدكتور)، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٨.
١٠-كمال مظهر احمد، (الدكتور)، دراسات في تأريخ ايران الحديث والمعاصر، مطبعة اركان، بغداد، ١٩٨٥.
١١-مكرم الطالباني (الدكتور)، ابراهيم خان ثائر من كردستان،مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧١.
١٢-ميجرسون، رحلة متنكره الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ترجمة فؤاد جميل، مطبعة التايمس، بغداد، الجزء الاول، ١٩٧٠، الجزء الثاني، ١٩٧١.
١٣-وليد حمدي، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، مطابع السجل العربي.

## ١٩٩٢.چوارەم: سەرچاوە فارسییەکان:

١-حسن ارفع، كردهاويك بررسى تاريخى وسياسى، ١٩٦٦.
٢-سيد على ميرينا، ايل هاو طايفه هاى عشايرى كرد ايران، ناشر مؤسسة اموزشى وانتشاراتى نسل دانش، تهران، ١٣٦٨.
٣-محمد رؤوف توكلى، جغرافياو تأريخ بانه، چاپ دوم، ١٣٦٣ش.

٤-نجفقلی بسیان، از مهاباد خونین تا گرانهای ارس، تهران، ١٩٤٩.

### پێنجەم: سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

1-Waheed. A. The Kurds and their countries.
A History of the Kurdistan People (from Earliest Times Present) Lahor, 1955.
2-Gavan, Kurdistan Divided Nation of Middle East, London, 1958.

### شەشەم: سۆراغ و گفتوگۆو بەڵگە:

١-خوالێخۆشبوو مەعروف ئەحمەد بەرزنجی (باوکی نووسەر)

٢-خوالێخۆشبوو ئەنوەر بەگی مەحمود خانی دزڵی.

٣-نامەیەکی دانسقەی ساڵی ١٩٢٤ی شێخ مەحموودی نەمر بۆ کەمالییەکان کە زانای مێژوونووس دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لەرۆژی ١٩٩٩/٩/١٠ دا بۆی ناردم.

٤-گفتوگۆیەکی تۆمارکراو لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ ئەمینی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی کە لە رۆژی ١٩٨٤/٦/٢٦دا مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف لەگەڵیدا سازی کردبوو.

٥-نامەیەکی دەستخەتی مێژوویی ساڵی ١٩٣١ کە لە لایەن مامۆستا (عبدالباسط فاتح دزڵانی)یەوە گەیشتە دەستم.

٦-دانیشتنێك لەگەڵ بەرێز مەلا عارفی مەلاعەبدوڵڵای مەریوانی.

# عومەر مەعروف بەرزنجی

*نووسەر کوڕی (مەعروف ئەحمەد عەلی بەرزنجی)یە، ساڵی ١٩٤٤ لەئاوایی بەرزنجە لەدایك بووە، ساڵی ١٩٦٥ بووە بەمامۆستاو لەچەندین قوتابخانە وانەی زمانی ئینگلیزی وتووەتەوە، بۆ نمونە:

قەمچوغە، کانی پانکە، ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوڕان، ناوەندی پەیامی کچان، دواناوەندی کوردستانی کچان، دواناوەندی بناری کچان، ناوەندی تووی مەلیکی کچان.

*یەکەم بەرهەمی دەگەڕێتەوە بۆ (٤١) ساڵ بەر لەئێستاولەژمارە (٩٧)ی ڕۆژی ٢٣ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٩)ی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) بڵاوکراوەتەوەو دەربارەی یادی سێیەم ساڵەی کۆچی دوایی شێخ مەحمودی حەفید زادەی بەرزنجی بووە.

*لەساڵانی (١٩٦٠-١٩٦١)، جگە لەبڵاوکردنەوەی بابەتی ئەدەبی‌و سیاسی، یەکێك بووە لەنووسەرە هەمیشەیی‌یەکانی گۆشەی (قوتابیانی کوردستان)ی ڕۆژنامەی (دەنگی کورد)و زنجیرەیەك بابەتی سەبارەت بەخەبات‌و پێویستی بوونی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بڵاوکردۆتەوە.

*لەساڵی (١٩٥٩) بەدواوە لەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بەرهەمی بەزمانی کوردی‌و عەرەبی بەزۆری بەرچاودەکەون:

پێشکەوتن، ژین، بڕوا، دەنگی کورد، ڕۆژی نوێ، هەتاو، هیوای کوردستان، هەولێر، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، پاشکۆی عێراق، برایەتی، نووسەری کورد، ڕۆژی کوردستان، کاڕوان، التآخي، العراق.

*لەژیانی‌دا بەزۆر ناو بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە وەك:

ع.تینو، ئارام، عومەر مەعروف بەرزنجی، ع.بەرزنجی

**بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:**

١-لێکۆڵینـەوەو بیبلیۆگرافیـای چـیرۆکی کـوردی، لـەچاپکراوەکانی کـۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.

٢-لێکۆڵینـەوەی هونـەری یـان هـەڵبژرکاندن!، لەبڵاوکراوەکانی نەفتـەی کوردەواری، چاپخانـەی عـەلا، بـەغدا، ١٩٧٨(باسێکی رەخنەیی یـە سـەبارەت بەهەڵەو کەموکورییەکانی کتێبی چیرۆکی هونەری کوردی (حسێن عارف).

٣-سـەرجەمی بەرهەمـەکانی مـارف بـەرزنجی، ئامـادەکردن و سـاغکردنەوەو پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسین، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٤.

٤-عوسمان مەعروف بەرزنجی-یاساناس و رۆشنبیرو مرۆڤ، سلێمانی، ١٩٩٧ (کۆمەڵێ بابەتی جیاوازە بەبۆنەی کۆچی دوایـی و چلـەی عوسمـان مـەعروف بەرزنجی)یەوە ئامادە کراوە.

**بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی نووسەر:**

١-جوگرافیـای ئـابووری بۆپـۆلی شەشـەمی ئـەدەبی، بـەهاوکاری مامۆسـتایان خەسرەو مستەفا، عەبدولکەریم شێخانی، کەریم زەندو حەمە غەریب، بەغدا، ١٩٨٣.

٢-سەرەتاکانی کۆمـەڵزانی و فەلسەفە بۆ پۆلی پێنجـەمی ئـەدەبی، بـەهاوکاری د.ئیحسان فوئاد، رەئوف حەسەن و فوئاد تاهیر سادق، بەغدا، ١٩٩١.

**کەوتە ژێرچاپەوە :**

(گۆران و ئەدەبی ئینگلیزی)، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری فراوانە

# سوپاس

## سوپاسێکی تایبەتی

لەناخی دڵەوە سوپاسی هەستی پیرۆزو میهرەبانی مامۆستاو زانای مێژوو نووسی کورد دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دەکەم کەبەمەبەستی پۆشتە کردنەوەی ناوەرۆکی ئەم کتێبە بەڵگەیەکی ئینگلیز دانسقەو دێرینی بۆ ناردم کەبریتی یە لەدەقی نامەیەکی مێژوویی ساڵی ١٩٢٤ی شێخی نەمری بەردەقارەمان بۆ کەمالی یەکان و ئەم نامە بەپێزەیش پەیوەندیەکی توندوتۆڵ و راستەوخۆی بەخەبات و هەڵوێستی مەحمود خانی دزڵی یەوە هەیە، بەم بۆنەیەشەوە سوپاس و رێزی تایبەتیم بۆ برای ئازیزم کاک دلاوەر عەلی سۆفی کەریمی سەراج کەدوای ماندوو بونێکی زۆر ئەو بەڵگەیەی گەیاندە دەستم.

## سوپاس و قەدر زانین بۆ

١-کارمەندانی کۆمپیوتەری ئەپڵ لەهەولێر کەدڵسۆزانە بایەخیان بەپیت چنینی چاپی یەکەمی کتێبەکە دا، کارمەندانی کۆمپیوتەری شەبەتک لەسلێمانی کەچاپی دووەمیان بەئەنجام گەیاند.

٢-ئەم برابەڕێزانەی کەهەریەکەیان بەجۆرێک ئەرکیان لەسەرشانم کەم کردەوە:

حەسەن جاف، ئاراس عبدالقادر مەعروف بەرزنجی، عبدالباسط فاتح دۆلانی، نەجمەدین مستەفا سەعید بەرزنجی، ئاسۆ سەعید، نەبەزی حاجی بەحیا، ئەحمەدی حەمکوڵ، سەردار تاهیر سەید محەمەد جەباری، هونەرمەند هاوڕێ عومەر مەجید

# پێڕست